له پێناو گەلێکی
خاوەن بڕیاردا

# بڕیار





مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا

104

ساڵی نۆیەم

شوباتی ٢٠١٧


## ئەی منداڵەکانمان؟!

## با ئاگامان لە سەرەتاکان بێت!

## ڕاستییەکان سەبارەت بە شەکر



## خانووەکەمان کانگەی هێز!



## ڕۆمانی (گەڕان بەشوێن ئافرەتێکی ونبوودا)

خاوەنی ئیمتیاز

د. مەسعوود تـاهیر ڕۆژبەیانی

سەرنووسەر

د. عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

بەڕێوەبەری نووسین

بەرزان ئەبوبەکر

دەستەی نووسەران

ئەسکەندەر ڕەحیم

بێگـەرد فــارس

زاهیــــر زانــــا

محەممەد مێرگەیی

محەممەد هاشم

وەهـاب حەسـیب

یەحیــا محەممەد

دیزاین

پشتیوان عبدالرحمن

تایپ

کەلسووم جەلال

ڕاوێژکاری یاسایی

پارێزەر: ئازاد محێدین

No: 104

شوباتی

2017

ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی: گەڕەکی باخان- شەقامی بۆتان- خانووی ژمارە ٧٤

تەنیشت باخچەی بەکر صدقی، بەرامبەر کینگ سپۆرت

٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢ - ٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧

هەولێر: ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

bryarmagazin@gmail.com bryarmagazine bryarmagazine

چاپ: پیرەمێرد دابەشکردن: پەیك/ 07708649210 نرخ: 2500 دینار

# بڕیار

مانگنامەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

سالی نۆیەم - ژمارە 104 - شوباتی 2017

## کارگێڕیو بازاڕسازی















# ئەی منداڵەکانمان؟!

کاتێـک دەوڵەتی بەنی ئومەییە ڕووخا، دەوڵەتو دەسـەڵاتیان لێ سـەنرا، ئەوەی مابـوو لە میـرو خەلیفەکانیان، خرانە نێـو زیندان، لە شـەوو ڕۆژێکدا، هەموو نازو نیعمەتو سـەروەتو سـامانێکیان لێ سەندرایەوەو خرانە نێو کونجی زیندانەوە!

لەوێدا دوای ئەو کارەساتە گەورەیە، پرسیاریان لێ کرا، چی شتێك لە زینداندا، زۆر ئازاری دانو خەفەتتان بۆچی شتێك زۆر خوارد؟!

لـە وەڵامدا گوتیان: تەنها شـتێك کـە خـەوی زڕاندبووینو زۆر نیگەرانـی کردبووینو جێگای خەمو پەژارەی ئێمە بوو، بێئاگایی ئێمە بـوو لە منداڵەکانمان؛ چونکە کاتێك لـە زینداندا بووین نەماندەزانی ئێستا کێ منداڵەکانمان پەروەردە دەکاتو چۆن پەروەردە دەکرێن؟!

هەڵبـەت ئەمڕۆ ئێمـە خەممان زۆرە، کێشـەو گرفتمان لە ژمارە نایـەت، بەڵام هەمـوو ئەمانە، نابێت ببن بەهۆی ئـەوەی پەروەردەی منداڵەکانمـان لە یـاد بکەین، بەداخـەوە منداڵان لە هەموو کێشـەو جەنـگو ململانێکاندا، باجی گەورە بەر ئەوان دەکەوێتو زەرەرمەندی یەکەم ئەوانن!

لە وڵاتی ئێمەشـدا، زۆرترین زیان لە هەموو کێشەو قەیرانەکاندا، بەر منداڵانو نەوەی نوێ کەوتووە!

پێـم وایە منداڵانی ئێمـە، لە منداڵانی وڵاتانی هـەژاری جیهانی سـێیەمیش مەحرووتـرن؛ چونکە ئێمـە بەناو لـە وڵاتێکی نەوتی دەوڵەمەنـدا دەژین، بەڵام هـەر بەناو، خۆ ئەگـەر وڵاتێکی ئەفریقی هـەژار بوایـن، هیچ نەبـا، ڕێکخـراوە خێرخوازیو مرۆڤدۆسـتەکان، هاوکاریـان دەکردینو قوتابخانـەو یاریگاو کتێبخانەیان بۆ درووسـت دەکرینو پێداویستییەکانی قوتابخانەو قوتابیو مامۆستاشیان بۆ دابین دەکردیـن، بـەڵام وڵاتە گەورەکان، بە پارەی ئێمـە دەژین، ئیدی چۆن ئەوان بێنو دەستی یارمەتی بۆ ئێمەی دەوڵەمەند ڕابکێشن!

دیارە کورد گوتەنی: ماڵ لە خاوەن ماڵ حەرامە!

بەڵام هەروەکو چۆن هیچ کەسـێك لە ئێمە، چاوەڕێی ئەوە ناکات کەسـانی دی بێـنو نانی بەیانی بـۆ منداڵەکانی دابین بـکات، نابێت مافە پەروەردەییو کەلتووریو ڕۆشـنبیرییەکانی نەوەکانمان فەرامۆش بکەین بە بیانووی ئەوەی کە ئەوە ئەرکی کەسانی دییە!

گـەر ئێمـە لە چاوەڕوانیدا بیـن؛ ئەوا منداڵەکانمـان پیر دەبنو هێشـتا بە کتێبو قەڵەمو نووسـینو شـیعرو چیرۆکو فڵچەو تابلۆو جوانییەکانی سرووشتی خودا ئاشنا نین!

لە وڵاتانی دراوسـێ، سـاڵانە سەدان پێشبڕکێی شـیعرو چیرۆکو نووسـینو خوێندنەوەو وەرزشو کاری دەستڕەنگینی بۆ منداڵانو لاوان ساز دەکرێت!

ئێمەش پەروەردەی منداڵانو لاوانمان داوەتە دەسـت تەلەفزیۆنو فەیسبووکو یوتیوب!

بەندە لێرەوە لەبری نەفرەتکردن لە تاریکی، مۆمێك دادەگیرسێنم! بانگێشـی هەموو باوکانو مامۆسـتایانو پەروەردەکاران دەکەم، بۆ کردنەوەی خولو پێشـبڕکێی خوێندنەوەو نووسـینی کورتەچیرۆکو خۆشنووسیو دەنگخۆشی و..هتد بۆ منداڵانو لاوان!

ئێمـەش وەکو گۆڤـاری بڕیـار، ئامـادەی هەمـوو هـاوکاریو دەسپێشـخەرییەکینو دڵنیاشـبن بە هـاوکاری هەموومـان، کاری زۆر گەورەمان پێ دەکرێتو هیچ نەبێت بە لێپرسـراویی مێژوویی خۆمان هەڵدەستین!

چاوەڕوانی پەیوەندی ئێوەی بەڕێزم بەم ناونیشانانە:

Kurdy555@yahoo.com

07503434000



# کارگێڕی بە گوفتار

حیکمەت وەربگرن، تەنانەت ئەگەر لەسەر زاری
بێباوەڕانیش بێت.

پەندێکی
عەرەبی

پادشاکان فەرمانڕەوای خەڵکین،
بەڵام حەکیمەکان فەرمانڕەوای پاشاکانن.

پەندێکی
هیندی

قسەی حەکیمان، بە بۆچوونی نەزانەکان، گەمژەییە.

ئۆرفیۆس

حەکیم ئەو شتەی نایزانێت، نایڵێت..
نەزان ئەو شتەی دەیڵێت، نایزانێت.

پەندێکی تورکی

عەقڵت بە حیکمەتو دانایی‌و ئەزموون پڕ بکە،
دڵیشت بەسۆزو بەزەیی.

قورەوی
شاعیر



# با ئاگامان لە سەرەتاکان بێت!

لاوێك دەستگیر کرا، لە کاتێکدا دزییەکی گەورەو بوێرانەی ئەنجام دەداو لە کۆتاییدا سزای لە سێدارەدانی بەسەردا درا، لە پێش جێبەجێکردنی سزاکەیدا، داوای کرد، کە ڕێگای بدەن، دایکی ببینێت؛ تا ماڵاوایی لێ بکات!

کاتێك کە دایکی هات، داوای لە دایکی کرد، زیاتر لێی نزیك ببێتەوە!

تا قسەیەکی تایبەت هەیە، دەیەوێت بە چرپە پێی ڕابگەیەنێت!

ئەو کاتەی دایکی بە تەواوی، گوێچکەی لە دەمی کوڕەکەی نزیك کردبوویەوە، لەناکاو زۆر بەتوندی قەپی بەگوێچکەی دایکیدا کرد، بە شێوەیەك ئەگەر فریای نەکەوتبان، گوێچکەی دایکی دەقرتاند!

ئامادەبووانی دادگا، سەریان سوڕما لەم هەڵسوکەوتە درندانەیە!

لێیان پرسی: بۆچی وات کرد؟

لە وەڵامدا گوتی: کاتێك منداڵ بووم دەستم بە دزینی شتی بچووك کرد، وردە وردە فێری دزیکردن بووم، بەڵام کاتێك کە شتەکانم دەهێنایەوە بۆ ماڵەوە، دایکم لەبری ئەوەی سزام بداتو لێم تووڕە بێت، دەستخۆشیی لێ دەکردو پێدەکەنیو دەیگوت: ئافەرین، کەس هەستت پێ ناکات!

**بە هۆی ئەوەوە بوو، کە من ئێستا لێرەم!!**

**لەم چیرۆکەوە فێر دەبین:**

١. گەر لەسەرەتاوە ئاگاداری پەروەردەی منداڵەکانمان بین؛ ئەوا لە کۆتاییدا، تووشی بەڵاو شکستی گەورە نابین.

٢. دزە گەورەکان، سەرەتا دزی بچکۆلە بوون، دەستخۆشیی ئێمە گەورەی کردن.

٣. نابێت بەرامبەر ڕەفتارە ناشیرینەکان، بێدەنگی هەڵبژێرین؛ چونکە بێدەنگی واتە: ڕازیبوونو بەشداربوون.

٤. مرۆڤە خراپەکانی ناو کۆمەڵگا، ئەوەی خۆمانن، ئەو منداڵانەن کە نەمانتوانی، یاخود نەمانویست باش پەروەردەیان بکەین.

٥. گرفتەکانی ئەمرۆمان، لەگەڵ تاکە خراپەکانی کۆمەڵگادا، بەرهەمی کەمتەرخەمیی خۆمانە!

٦. ئەگەر نەوەکانمان لەسەر خۆشەویستیی نیشتمانو دەستپاکیو ڕاستگۆییو دڵسۆزیی پەروەردە بکەین؛ ئەوا لە سایەیاندا دەحەسێینەوە!

بەپێچەوانەشەوە، ئەگەر فەرامۆشیان بکەین؛ ئەوا دەبنە داردەستی دوژمنان بۆ کاولکردنی وڵاتو فرۆشتنی هەموو سەروەتو سامانی نیشتمان بە دوژمنانو وڵاتەکەمان دەکەینە کارگەی دروستکردنی مرۆڤە خراپەکان، پێشینان ڕاستیان گوتووە کە دەڵێن:

دار پوازی لە خۆی نەبێت، هەزار ساڵ دەژی!

# تەنها بۆ سەرکردەکان

مرۆڤ بە ئازادی لە دایک دەبێت، بەڵام لە هەموو شوێنێک، زنجیری بەکۆیلەکردن رادەکێشێت.

جان جاك رۆسۆ

یەکەم بەرپرسیارێتیی سەرکردە، دیاریکردنی ڕاستییەکانە، دوا بەرپرسیارێتیشی، پێشکەشکردنی سوپاسە بە کەسانی دی، لەو نێوەندەشدا دەبێت سەرکردە خۆی بە خزمەتکاری نیشتمانەکەی بزانێت.

ماکس دیبری

پێش ئەوەی ببیتە سەرکردە، پێویستە هەوڵ بدەیت لە هەموو کارەکانتدا سەرکەوتوو بیت، کار بکە بۆ بەرەوپێشبردنی خودی خۆت، کاتێك دەبیتە سەرکردە، ئەو کات پێویستە کار بکەیت بۆ پێشخستنی کەسانی دیکە.

دی. جاك وێلش

سەرکردە ئەو کەسەیە کە شارەزای ڕێگەیە، دەتوانێت بەڕێگەکەدا بڕوات، هەروەها بۆمان ڕوون دەکاتەوە، کە چی لە ڕێگەدا هەیە.

جۆن ماکسوێل

سەرکردایەتی بریتییە لە بەرزکردنەوەی ڕاو بۆچوونی کەسەکان، بۆ شوێنە بەرزەکان، بەرزکردنەوەی تواناکانیان بۆ بەرزترین ئاست، بونیادنانی کەسایەتییان بۆ ئاستێك کە لە سنووری سرووشتی خۆیان تێپەڕێت.

پیتەر دراکەر



# خاڵە لاوازەکانی کارمەندەکانت چارەسەر بکە

کاتێك ئەداو کارکردنی کارمەند، لەوەی شایستەو پێویستە کەمترە؛ ئەوا ئەرکی سەرشانی بەڕێوەبەرە، هۆکارەکەی بزانێت. ئەوەی گرنگە لێرەدا، ئەوەیە هۆکارە ڕاستەقینەکان بزانێتو هەر بە بەهانەو ڕواڵەتە بەرچاوەکان، کوڵی دڵی دانەمرکێتو ڕازی نەبێت.

کاتێك گرفتی کارمەندەکەت، بریتییە لە بایەخنەدان بەخۆو خۆنەشیاوی، پێویستە هەندێك گرنگیدان بەخۆی تێدا بچێنێت.

خۆ ئەگەر گرفتەکە، بریتی بوو لە ترس؛ ئەوا متمانەبەخۆبوونی تێدا بچێنە.

وەلێ ئەگەر گرفتەکە، فەرامۆشکردنو گوێنەدان بوو؛ ئەوا دەبێت بەرپرسیارێتیی فێرکردنو ڕاهێنانی لەئەستۆ بگریت.

لە هەر هەلومەرجێکدا بێت، سەرنجت لەسەر هۆکارەکانی گرفتەکەدا قاڵ بکەرەوە، نەك نیشانەکانی.

لە خۆیشت بپرسە: بۆئەوەی کارمەندەکە، کارەکە ڕاپەڕێنێت، چ یارمەتییەکت لەدەست دێت؟ دەشبێت وریای ئەوە بیت درێژە بە باسکردنی ئەو هەڵانەی ڕابوردوو نەدەیت، کە ڕەنگدانەوەی خاڵە لاوازەکانی پێشوویەتی.

### کەسی شیاو، لە شوێنی شیاودا

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم پرسە، با لە چەند نموونەیەك بڕوانین:

کەسی کۆمەڵایەتی، ئەوەی پێ خۆشە کار لەگەڵ کەسانی دیکەدا بکات، جا ئەگەر کەسێکی لەم چەشنەت، لە نووسینگەیەکی دابڕاودا دانا؛ ئەوا ڕووبەڕووی دوو گرفت دەبێتەوە:

یەکەمیان: کارەکەی پێ ڕاناپەڕێنرێت..

دووەمیان: سوودوەرگرتن لە بەهرەیەکی ڕاست لەدەست دەدەیت.

کەسی دوورەپەرێزو خۆبەدوورگریش، وەهای پێ پەسەندە، بەتەنها کار بکات.. ئەم جۆرە کەسە، کاری نووسینو ئیمەیڵو نامەناردنی پێ بسپێرە.. با لەگەڵ ژمارەکاندا مامەڵە بکاتو لێشاوێکی نەبڕاوەی ڕاپۆرتەکان بخوێنێتەوە.. بەڵام ئەگەر وازت لێ هێنا؛ تا لەگەڵ گرۆی کارێکدا کار بکات؛ ئەوا دەبێت بە گوڵێکی بە دیواردا هەڵواسراوو بەس.

هەرچی کەسانی دەمارگرژو توندەمیزاجیشن، پێویستیان بە شوێنکارو نووسینگەی پڕ لە ئارامیو هێوری هەیە.

خۆ ئەگەر ئەم جۆرە کەسانەت. لە شوێنو نووسینگەی جەنجاڵو پڕ لە دەنگەدەنگدا دانا؛ ئەوا پاش ماوەیەك خۆ ناگرنو گڕکانی تووڕەییان دەتەقێتەوە.

سەبارەت بە کەسە زیرەكو هیوابەرزەکانیش، ئەوانە کەسانێکن حەوسەڵەی کاری ڕۆتینیو ناداهێنەرانەیان نییە.

ئەوانە کەسانێکن دەستپێشخەریو ڕچەشکێنی دەکەنو لەگەڵ ئەو ئاستەنگو ململانێیانەدا تواناکانیان دەردەخەنو سەرکەوتنی زۆرتریان پێ دەبەخشن کارلێك دەکەنو ئاوێتە دەبن.



# لەکاتی تەنگژەدا، چۆن وتوویژ لەتەك تیمەکەتدا دەکەیت؟

لە کاتی تەنگوچەڵەمەدا، خاوەنکارو بەرپرسەکان، تووشی شڵەژان دەبن! لە سێبەری وەها باروودۆخێکدا، کاردانەوەی ئەو بەرپرسانە لە هەڵچوون، زاڵنەبوون بە سەر دەروونیاندا ڕەنگ دەداتەوە، پاشان پەرچەکرداری ئەو باروودۆخە، بەشێوەیەکی خراپ بەسەر هاوکارانیاندا دەشکێتەوە، بەتایبەت لە کاتی گفتوگۆکردندا. ئەوەی ئە مرۆ لە سێبەری ئەو تەنگەژە ئابوورییە جیهانییەدا دەیبینین، ڕەنگە داوامان لێ بکات تێ ڕابمێنین‌و لەگەڵ فکران ڕاچین، چەندن ئەو خاوەن کارو پیشانەی بەهۆی ئەو ئاریشە ئابوورییەوە ترس‌و دڵەڕاوکێیان لە ناخی هاوکارانیدا دروست کردوە، بە چ شێوەیەك گۆشیان دەکەن، کە ئەو کێشەیە هۆکاری لەدەستدانی کارو پیشەکانیانە، ئەو کارەش چەندین هۆکارو ئەگەری دیکە، بە دوای خۆیدا دەهێنێت.

بێگومان هەموو کات ڕەچاوکردنی شێوازی گوتوویژ پێویستە، بەڵام لە کاتی قەیراندا دەبێت بە پێویستی‌و پێویستە کاری بۆ بکرێت، بۆچی؟ چونکە تا ئارامی‌و دڵنیایی لە نێو کارمەندناندا بڵاو ببێتەوە.

**ئەوکارەش لەخۆڕا پێکنایەت، بەڵکوو پێویستە بەم شێوازانە هەوڵی بۆ بدرێت:**

**١. خۆت بپارێزە لە سەرزەنشتکردن بەشێوەی ڕاستەوخۆ:**

بە هۆی هەڵوێستێکەوە، لەوانەیە هەندێك لە دامەزراوەکان کارێکی نابەرپرسانە ئەنجام بدەن، ئەو کارەش هۆکاری سەرزەنشتکردنیان بێت، بەڵام لە بری لۆمەکردنیان بەهەڵە، باشتر وایە ئاماژە بۆ ئەو هۆکارە بکرێت، کە کارمەندەکەی تووشی ئەو خەتایە کردووە، پێویستە کارەکە ڕاڤە بکرێتو بەشێوەیەك شیکار بکرێت، تا لە توانادا بێت بە ڕەفتارێك ئەو کێشەیە ڕاست بکرێتەوە، پاشان لە تەواوکردنی کارەکاندا کار بەو ڕەفتارە بکرێت.

**٢. دارەکە لە ناوەڕاستەوە بگرە بە دەستەوە:**

لە کاتێکدا باسی تەنگوچەڵەمەیەك دەکەیت، بەشێوەیەك گوزارشتی لێمەکە کە ترس‌و بیم لە ناخی کارمەندەکاندا بڵاو بکاتەوە، وەك ئەوەی ئەم کێشەیە کاریگەریی ڕووخێنەری لێ دەکەوێتەوە، یان ماڵمان وێران دەکات، یاخود هاوشێوەی ئەم گوزارشتانە، کە باسکردنیان هۆکارێك نین بۆ بیناکردنی باوەڕو ورە لە ناخی دامەزراوەکاندا، کەواتە: بەشێوەیەکی دیکە ئەو پەیڤانە بەکار بهێنە کە بەڕاستی گوزارشت لە ئاریشەکان دەکەن، وەك کاریگەریی خراپو باروودۆخی گران هۆکاری ئەو کێشانەن کە دەبن بە ئاستەنگ لە بەردەم تەواوکردن، یان بەرەو پێشچوونی ئامانجەکاندا لە لایەکو لە لایەك؛ بۆئەوەی بتوانیت وەك بەرپرسێك پەیامی خۆت بگەیەنیت بە هاوکارانت، هەروەها بە دیوێکی تردا ڕادەی شڵەژانو دڵەڕاوکێ لە ناخی هاوکارانتدا کەم بکەیتەوە، پێویستە دارەکە لە ناوەڕاستەوە بە دەستەوە بگریت.

**٣. وتەکانت دەرمەپەڕێنە:**

لە کاتێکدا بۆ دامەزراوەکانت دئاخفیت، بەتایبەت لە کاتی تەنگوچەڵەمەدا، بێگومان پێویستت بە لەسەرخۆیی‌و هەڵنەچوونە؛ چونکە ئارامی لە ناخی گوێگراندا دڵنیایی‌و ئارامی دروست دەکات، هاوکات لەسەر پێداگری لە وەرگرتنی پەیڤەکاندا ڕایان دەهێنێت، ئەو جۆرە ڕەفتارە کاتێکی تەواوت بۆ فەراهەم دەکات بۆ گوێگرتن لە پرسیارەکانو وەڵامدانەوەیان بە گوێرەی پێویست.

**٤. جەختکردنەوە لەسەر ڕاستییەکان:**

لە وتوویژدا ڕاستگۆو ڕاشکاو بە، ئەم هەڵوێستە بە جەختکردنەوە لەسەر ڕاستییەکانو لا نەکردنەوەیە بۆ سەر ئەو بابەتانەی ترس‌و دڵەڕاوکێ دروست دەکەن.



# جیهان لە ساڵی ٢٠٥٠ دا چۆنە؟

لە فارسییەوە: زریان مەحموود

لەم نووسینەدا هەوڵ دراوە بەپێی پێشبینیی شارەزایان، جیهان لە ساڵی ٢٠٥٠ وێنا بکرێتو ئاماژە بە لایەنە بەرچاوەکانی ئەم بابەتە بکرێت؛ چونکە ئەوەی کە جیهان لە ئایندەدا چۆن دەبێت؟ جێگەی پرسیارو رامانی زۆرینەی خەڵکە.

زۆرینەی لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە جیهان لە ساڵی ٢٠٥٠ چۆنەو چ شێوەیەکە؟ لێکدانەوەیەکی خراپ دەکەنو نیگایەکی بەدبینانەیان هەیەو ئایندەیەکی ترسناك بۆ جیهان پێشبینی دەکەن. لەسەر بنەمای ئەوەی کە بە هۆکارگەلی وەکو زیادبوونی زیاد لە رادەی پلەی گەرمای زەویو لێکەوتو بەڵا سرووشتییەکان هێرشی بوونەوەرە گەردوونییەکان، یان جەنگی ئەتۆمی، جیهان وێران دەبێت. وەلێ لە لایەکی ترەوە ژمارەیەکی زۆر بە ئایندەی جیهان گەشبینن. ئەوان سەرباری خەملاندنی ئەو پرسەی کە بەهۆی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوانی جیهانو کەمبوونەوەی سەرچاوەکان، جیهان رووبەڕووی کێشەگەلێك دەبێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەیان بە پێشکەوتنە کۆمەڵایەتیو ئابوورییەکانو داهێنانو نوێگەرییەکانی مرۆڤ کردووە، ئایندەیەکی رۆشن بۆ جیهان وێنا دەکەن.

### ئابووریی جیهان لە ساڵی ٢٠٥٠

لە نێوان ساڵەکانی ٢٠١٤ هەتا ساڵی٢٠٥٠ بەشێوەیەکی ناوەندی لە ساڵێکدا لە ٣٪ گەشە دەکات. ئەمەش بەو مانایەیە کە ئابووریی جیهان هەتا ساڵی ٢٠٣٧ دو بەرابەرو هەتا ساڵی ٢٠٥٠ نزیکەی سێ بەرابەر گەشە دەکات. هیندستان لە ساڵی ٢٠٥٠ بە جێگرتنەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان پێگەی دووەم ئابووریی جیهان لە دوای چین بە خۆیەوە تایبەت دەکات. لە ساڵی ٢٠١٤ چین بە بەرهەمی ناوخۆیی زیاتر لە ٦٣٢ ملیاردو ١٧ هەزار دۆلار پێگەی یەکەمو ئەمریکا ٤١٦ ملیاردو ١٧ هەزار دۆلار پێگەی دووەمو هیندستان بە ٢٧٧ ملیاردو ٧ هەزار دۆلار پێگەی سێهەمیان هەبوو.

ئەمە لە کاتێکدایە کە پێشبینی دەکرێت، لە ساڵی ٢٠٥٠ چین بە بەرهەمی ناوخۆیی ٧٩ ملیاردو ٦١ هەزار دۆلاری پێگەی یەکەمی جیهان بگرێت، بەڵام هیندستان بەگەشەی بەرچاوی ئابووری، بە بەرهەمی ناوخۆیی ٢٠٥ ملیاردو ٤٢ هەزار دۆلاری، لە بەرهەمی ناوخۆیی ٣٨٤ ملیاردو ٤١ هەزار دۆلاری ویلایەتە یەکگرتووەکان پێش بگرێت. هەروەها پێشبینی دەکرێت مەودای نێوان سێ ئابوورییە گەورەکەی جیهان، واتە: چین، هیندستانو ئەمریکا، لە دەیەکانی ئایندەدا بە بەراورد بە وڵاتانی تر، زیاترو زیاتر ببێت.

لەم گۆڕانە گەورە ئابوورییەدا، ئابووریی وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان، پێش بەرهەمی ناوخۆیی وڵاتانی گرووپی حەوت دەکەون. ئەمە بەو مانایەیە، کە لە ساڵی ٢٠٥٠، کۆی بەرهەمی ناوخۆیی وڵاتانی چین، هیندستان، بەرازیل، مەکسیك، روسیا، ئەندەنوزیاو تورکیا، زۆر زیاتر لە ١٠٠ ملیار دۆلار دەبێتو ئەم ژمارەیەش لەبارەی وڵاتانی کەنەدا، فەرەنسا، ئەڵمانیا، ئیتاڵیا، ژاپۆن، بەریتانیاو ویلایەتە یەکگرتووەکان، تەنانەت بە ١٠٠ ملیارد دۆلاریش ناگات. ستۆڤن واڵت، مامۆستای پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لە زانکۆی هارڤارد، پێشبینی دەکات ویلایەتە یەکگرتووەکان، چین، ژاپۆن، هیندستان، بەرازیل، رووسیاو یەکێتیی ئەوروپا رۆڵگێڕانی سەرەکیی جیهان دەبن لە ساڵی ٢٠٥٠.

### ژمارەی دانیشتوانی جیهان لە ساڵی ٢٠٥٠

بەپێی توێژینەوەکانی سەنتەری توێژینەوەی پایۆ، دانیشتوانی جیهان لە ساڵی ٢٠١٠، ٦ ملیاردو ٩٠٠ ملیۆن کەس بووە، لە ٢٠٥٠ بە ٩ ملیاردو ٦٠٠ ملیۆن کەس دەگاتو ئەم گەشەکردنە سەر سوڕهێنەرەی دانیشتوانی جیهان، بەپێی راپۆرتەکانی دەزگای خۆراكو کشتوکاڵی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، سەردەکێشێت بۆ کەمبوونەوەی خۆراك لە جیهاندا. پێشبینی زیادبوونی دانیشتوانی جیهان یەکێکە لە دڵنیاترین پێشبینییەکان لەبارەی ئایندەی جیهانەوە. چینو هیندستان، لانی کەم هەریەکەو یەك ملیارد کەس دانیشتوانیان دەبێتو دانیشتوانی ویلایەتە یەکگرتووەکانیش نزیکەی ٤٠٠ ملیۆن کەس دەبێت. ئەم پێشبینییە بۆ وڵاتانی تری جیهانیش بەپێی دانیشتوانی ئێستایانو ئاستی گەشەی ئابوورییان راستە.

### ژینگەی جیهان لە ساڵی ٢٠٥٠

ترشبوونی زەریاکان بابەتێکی بەهەندی گۆڕانی ژینگەو کەشوهەوایە، کە مرۆڤ لە ئایندەدا رووبەڕووی دەبێتەوە.ئۆکسیدی کاربۆنی زیادەی بەرهەمهێنراو لەلایەن مرۆڤەوە دەکرێتە ناو

ئۆقیانووسەکانو دەگۆڕدرێت بە ئەسیدی کاربۆنیك، ئەوەش بە تێپەڕبوونی کات، دەبێتە هۆی زیادبوونی ئەندازەی خاسیەتی ئەسیدی زەریاکان بە ڕادەی لەسەدا ٣٠. ئەم زیادبوونەی ئەسید "ترش" لە زەریاکاندا، دەبێتە هۆی ئەوەی کە هاوسەنگی پێکهاتە کاربۆنییەکانی ناو ئاو تێك بچێتو نەوەی ئایندەی گیانەوەرەکان بکەوێتە مەترسییەوە.

بەپێی ڕاپۆرتی دامەزراوەی داوەری ژینگەیی (ئەی. جی.ئێف)، گەرمیی جیهان لە ٤٠ ساڵی ئایندەدا، دەبێتە هۆی ئەوەی کە نزیکەی ١٥٠ ملیۆن کەس بەناونیشانی "پەنابەرانی ئاوهەوایی" کۆچ بکەن بۆ وڵاتانی تر. تەنها لە ساڵی ٢٠٠٨ زیاتر لە ٢٠ ملیۆن کەس بەهۆی تێکچوونی ئاووهەواوە کۆچیان کردو شوێنی خۆیان گۆڕی.

نۆرمان مایەرز لە کتێبی "پەنابەرانی ژینگەیی"دا دەری دەخات کە ئەم پەنابەرە ژینگەییانە، هەر زوو دەبن بە زۆرترین گرووپی پەنابەری ناچاریی جیهان. ئەو دەشڵێت هەتا ساڵی ٢٠٥٠ ژمارەی ئەم پەنابەرانە، زیاتر دەبێت لە ٢٠٠ ملیۆن کەس.

کەمبوونەوەی ئاو، یەکێکە لە گرنگترین بابەتە ژینگەییەکان، کە جیهان لە ئایندەدا ڕووبەڕووی دەبێتەوە. ئاو بە یەکێك لە گرنگترین لە سەرچاوەکانی جیهان ئەژمار دەکرێتو لە سەرانسەری جیهاندا، وڵاتان خۆیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی قەیرانی کەمئاوی ئامادە دەکەن. هیندستان، بە ناونیشانی یەکێك لەو وڵاتانەی زۆرترین دانیشتووی هەیە، زیاتر هەست بەم مەترسییە دەکات؛ چونکە بەپێی پێشبینیو توێژینەوەکان هەتا ساڵی ٢٠٥٠ داواکاری لەسەر ئاو، بۆ دوو هێندەی ئێستا بەرز دەبێتەوە. بەپێی ڕاپۆرتێکی سەنتەری نێونەتەوەیی ئاوو ئاوەڕۆ، بەنزیکەیی هەموو وڵاتە عەرەبییەکان، لە دەیەکانی ئایندەدا، ڕووبەڕووی کێشەی کەمئاوی دەبنەوە. بەپێی ڕاپۆرتێکی ساندیا لابنیوز، تا ساڵی ٢٠٢٥، زیاتر لە نیوەی وڵاتانی جیهان، ڕووبەڕووی قەیرانی کەمئاوی دەبنەوەو تا ٢٥ ساڵ دواتریش، واتە؛ هەتا ساڵی ٢٠٥٠ زیاتر لە ٧٥ لە سەدی دانیشتوانی جیهان، لەگەڵ کەمئاویدا دەستو پەنجە نەرم دەکەن.

## دین لە ساڵی ٢٠٥٠

بەپێی ڕاپۆرتەکانی سەنتەری توێژینەوەی پایۆ، گۆڕانی شێوەی دینی لە جیهاندا، بە شێوەیەکی سەرەکی، بەهۆی جیاوازی ڕادەی وەچەخستنەوەو ژمارەی گەنج لەناو کۆمەڵگای ئایینە سەرەکییەکاندایەو بەو ڕادەیە بە هۆی گۆڕینی ئاینەوە لەلایەن تاکەکانەوە. لە ماوەی چوار دەیەی ئایندەدا، ئایینی مەسیحی بە گەورەترین گرووپی ئاینی جیهان دەمێنێتەوە، بەڵام گەشەی ئاینی ئیسلام، زۆر خێراتر دەبێت لە هەموو ئایینەکانی تر. دانیشتوانی موسوڵمانانی جیهان، بەهۆی گەنجبوونو هەبوونی بەهای بەرزی هاوسەرگیریو وەچەخستنەوەوە، ساڵی ٢٠٥٠ بەبەراورد بە باقی دانیشتوانی جیهان دوو هێندە گەشە دەکات. بەم پێیەش دانیشتوانی موسوڵمانانی جیهان بەپێی ڕاپۆرتەکانی سەنتەری توێژینەوەی پایۆ، لە ساڵی ٢٠٧٠ بەرابەر دەبێت لەگەڵ ژمارەی مەسیحیانی جیهانداو بەتێپەڕبوونی کاتیش زیاتر دەبێت بە شێوەیەك کە هەتا ساڵی ٢١٠٠، دانیشتوانی موسوڵمانانی جیهان نزیکەی یەك لە صەد زیاتر دەبێت لە دانیشتوانی مەسیحیانی جیهان.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەوروپا، جێگایەك کە بە درێژایی مێژوو مەسیحیەت تێیدا دەسەڵاتداربووە، ئەمڕۆ شاهیدی ئەو ڕاستییەین کە ئەوروپا ناوچەیەکە کە لە ساڵی ئایندە ژمارەی مەسیحیان لە کەمبوونەوەدایە. لە ساڵی ٢٠١٠ نزیکەی ٧٥٪ی دانیشتوانی ئەوروپا مەسیحی بوون، بەپێی پێشبینی پایۆ لە ساڵی ٢٠٥٠ ئەم ڕێژەیە دادەبەزێت بۆ ٦٥٪. لەلایەکی تریشەوە چاوەڕوان دەکرێت، کە دانیشتوانی موسوڵمانان لە ئەوروپادا لە چوار دەیەی ئاینده بۆ ٢٨ ملیۆن کەس بەرز ببێتەوە. بەو پێیەش لە ساڵی ٢٠٥٠ موسوڵمانان زیاتر ١٠٪ دانیشتوانی ئەوروپا پێك دەهێنن.

هۆکاری سەرەکی ئەم گۆڕانکارییە لە دانیشتوانی دینەکاندا، تەمەنو بەهای هاوسەرگیریو کۆچکردنەو گۆڕینی دین هۆکارێکی لاوەکییە. لە ماوەی ساڵەکانی ٢٠١٠ هەتا ٢٠٥٠ گەڕانەوە بۆ ئیسلام لە دوای مەسیحیەت لە پلەی دووەمدا دەبێت، بەڵام وازهێنان لە مەسیحیەت دە هێندەی وازهێنان لە ئیسلام دەبێتو هەر ئەم هۆکارەش ئیسلام دەخاتە پلەی پێشی گەشەی دانیشتوانی.

هەربەپێی زانیارییەکانی پایۆ، ئەو پێشبینییە ڕەد دەکرێتەوە کە جیهان لە ساڵانی ئایندەدا بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو بەرەو سیکۆلاربوون دەڕوات. لە ٤٠ ساڵی ئایندەدا دانیشتوانی بێ دینی جیهان تەنها ١٣ لەصەد دەبێت کە بە بەراورد بە ساڵی ٢٠١٠ کەمترە. کۆنراد هۆکت دەڵێت: "بەپێی پێشبینییەکانی سیکۆلاریزاسیۆن ئایندەی جیهان لە ڕەهەندی فەرهەنگییەوە لەژێر سوڵتەی ڕۆژئاوادا دەبێتو ئەوە ڕاستە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانو ئەوروپا لە ساڵانی ئایندەدا کەمتر دینی دەبن، بەڵام بەپێی ڕێژەو ژمارە، ڕۆژئاوا لە حاڵی بچووکبوونەوەدایەو باقی جیهان ڕێگایەکی زۆر جیاوازی گرتۆتە بەرو بەرەو خودا لە جووڵەدایە.

ئەو لەو باوەڕەدایە کە شەمەندەفەری جیهان لەسەر سکەیەك دەڕوات، کە زیاتر بەرەو مەبەستێکی دینی دەبات. ئەم دینی بوونەش بەرەو هەموان سەردەکێشێت. ئەوەش بەو مانایەیە کە هۆگرییە جیاوازە دینییەکان کەمی کردووەو پێشبینی دەکرێت کە لە ساڵی ٢١٠٠ دوو لەسەر سێی دانیشتوانی جیهان پێك بهێنن.

## داهێنانی جیهان لە ساڵی ٢٠٥٠

مارتین ڕیز لە وتارێکیدا لە ڕۆژنامەی گاردیان، لەو باوەڕەدایە کە یەکێك لە سەختترین پێشبینییەکان لەبارەی ئایندەوە، پێشبینیی داهێنانە. هەر بەوشێوەیەی کە باشترینو لێهاتووترین زانایانیش لە ڕابوردوودا نەیانتوانیبوو شوێنەواری فیزیکیبوونی پێشبینی بکەنو وێناکردنی دنیایەکی وەکو ئەمڕۆ بە مۆبایلە زیرەکەکانەوە، هاوشێوەی موعجیزەیەك بوو. هەر مۆبایلێکی زیرەکی ئەمڕۆ توانای گواستنەوەی کۆمپیوتەری زۆر زیاترو بەهێزترە لە هەموو سیستمی گواستنەوەی زانیاری کۆمپیوتەری ناسا لە ساڵی١٩٦٠. هەندێك لەو باوەڕەدان کەلە ساڵی ٢٠٥٠ توانای کۆمپیوتەرەکان بگاتە توانای مرۆڤ. ئەڵبەتە لە هەندێك لایەنەوە بەشێکیان توانایان بە توانای مرۆڤ گەشتووە. هەتا ٣٠ ساڵی ئایندە، دەتوانین ئامێری حسابی بکرین کە لە لۆژیکدا زۆر لە مرۆڤ زیرەکترن. بە باوەڕبەخۆبوونێکی بەرزەوە دەتوانین پێشبینیو چاوەڕوانی داهێنانەکانو پێشکەوتنەکانی مرۆڤ لە بواری توانای کۆمپیوتەریو تەکنیکەکانی توێژینەوە بکەین.

سەرچاوە/بازدە(مجلەی کسبو کار)




# کارو ئامانجی بانکە ئیسلامییەکان ۲/۲

وەهاب حەسیب محەممەد

## شێوازی کارکردنی بانکە ئیسلامییەکان:

### ١. بە گەڕخستنی سەرمایە لەسەر بنەمای قازانجو زەرەر:

ئەم شێوازە بە چەند جۆرێك پیادە دەکرێت:

#### أ. Speculation خەملاندن، یان گرێبەستی قەرز:

هاوکارییەکە لە نێوان خاوەنپارەو خاوەنکاردا، بەم شێوازەو بۆ قازانج لە نێوان خاوەنسەرمایەو کەسێکی شارەزادا گرێبەست دەکرێت، بەشێوەیەك کەسی یەکەم بڕێك پارە بۆ لایەنی بەرانبەر دابین دەکات؛ تا لە ڕێگای شارەزایی‌و کارامەییەوە وەبەرهێنانی پێوە بکات، بەم گرێبەستە دەگوترێت خەملاندن، هەردوو لایەن لەسەر بڕی زەرەرو قازانج ڕێك دەکەون، ئەگەر لە دەرەوەی گرێبەستەکە کارەکەیان نوشستی هێنا، یان تووشی زەرەر هاتن؛ ئەو کات تەنها سەرمایەدارەکە، زەرەرەکە لە ئەستۆ دەگرێت، کەسی شارەزا، یان دەستڕەنگین تەنها کۆششەکەی با دەیبات.

#### ب. بەشداریکردن:

لە ڕێساکانی ئیسلامدا، سەرمایە هۆکارێکە لە هۆکارەکانی بەرهەمهێنان، ڕێگە بە خاوەن سەرمایە دەدات سوود لە سەرمایەکەی وەربگرێت، بەڵام لە ڕێگای قازانجی پێشوەختەوە نا، بەڵکوو لە ڕێگای داهاتی پڕۆژەکانەوە.

بەشداریکردن واتە: بەشداریکردنی دووکەس، یان زیاتر لە سەرمایەو کاردا، یاخود هەردووکیان پێکەوە، بە هیوای بەدیهێنانی ئامانجێك، بەگوێرەی دەستکەوتی کارەکە پشکی هەر کەسێك، یان لایەنێکیان بەپێی گرێبەستەکە دیاریدەکرێت.

### ٢. مرابحة "قازانجگۆڕکێ":

لەم شێوازەدا، کڕیار داوا لە بانك دەکات، شمەکێکی دیاریکراوو بەگوێرەی دڵخوازی خۆی بۆ بکڕێت، لێرەدا بانکەکە قازانجێکی کەمی دەخاتە سەر، کە بە (هامش ڕبح) ناودەبرێت، دانەوەی قەرزەکەش لە ماوەیەکی دیاریکراودا دەبێت، بەجارێك، یان بەشێوەی بەش بەش (قسط)، دابینکردنی پارە بەم شێوازە، بەگشتی کورت مەودایە، بانکی ئیسلامیش لەم بوارەدا، ئەو گوژمە نەختینەیە دەخاتە گەڕ کە لە بەردەستیدایە.

### ٣. فرۆشتنی درووستکراوەکان:

لەم شێوازەدا، بانکی ئیسلامی درووستکراوێك لە بەرچاو دەگرێتو ئارەزووی درووستکردنی دەکات، پاشان داوا لە کارسازان دەکات، داواکارییەکەی جێبەجێ بکەن، پێشەکی نرخی داواکارییەکەی دەدات، پاش ئەوەی شمەکەکەی ڕادەست

کرا بەهۆی ئەو پەیوەندییە فراوانەی لەتەك پیشەوەرانو بازرگاناندا هەیەتی، بانکی ئیسلامی بەقەرز، یان بەنەختی دەست دەکات بە فرۆشتنی شمەکەکەی.

٤. بەکرێدان:

شێوازێکە بۆ یارمەتیی کرێارانو مامەڵەکاران، لەم شێوازەدا بانکی ئیسلامی کۆمەڵێك بنەما دەکرێت (وەك خانوو باڵەخانە، ئامرازو ئامێری پیشەسازیو بازرگانی) پاشان دەیدات بەکرێ، بە شێوەیەك خاوەندارێتییەکەیان بۆ بانکە ئیسلامییەکە بمێنێتەوە.

## گرنگترین کارو خزمەتگوزاری بانکە ئیسلامییەکان:

١. حسابی جاری: بریتییە لە برە پارەیەك لە بانکدا دادەنرێت، هەرکات خاوەنی پارەکە مەبەستی بوو، دەتوانێت بەشێك، یان هەموو پارەکە لە بانکەکە وەربگرێتەوە، لە بانکە ئاساییەکاندا، حسابی جاری هیچ قازانجێکی ناچێتە سەر، بەڵکوو لە بەرانبەر خزمەتگوزاریی بانکیو کاری تیانووسدا، برێك لە پارەکە دادەشکێنرێت، بەڵام لەم بوارەدا بانکە ئیسلامییەکان ئەو مافەیان بەخۆیانداوە، وەبەرهێنان لەو برە پارەیەدا بکەن، ئەو کارەش دەچێتە خانەی (قرض الحسن)ـەوە. هەرکات خاوەن پارەکە داوای پارەکەی کردەوە؛ ئەوا بێ کەمو زیاد، پارەکەی وەردەگرێتەوە.

٢. سپاردەی پاشەکەوت (الودائع الادخارية): زۆربەی کات سپاردەکان بچووکن، خاوەنەکەی لە دەفتەرێکی پاشەکەوتدا دایدەنێت، هەرکات ویستی؛ دەتوانێت بەشێك، یان هەموو سپاردەکە بباتەوە، بەڵام خاوەن سپاردەکە، مافی ئەوەی نییە دەفتەری چەکی پارەکە لە سەر سپاردەکە رابکێشێت، بانکە ئیسلامییەکان، بە دووشێوە لەتەك سپاردەی پاشەکەوتدا مامەڵە دەکەن:

أ. مامەڵەی (قرض الحسن)، لەم شێوازەداو لە ئەنجامی وەبەرهێنان لەو برە پارەیەدا، خاوەن قەرز هیچ قازانج، یان زەرەرێك ناکات.

ب. حسابی وەبەرهێنان، لێرەدا خاوەن پارەکە بەشێك لە پارەکەی لە بواری وەبەرهێناندا دادەنێتو بەشەکەی دیکەی وەك سپاردە لە بانکەکەدا بۆ تەواوکردنی پێداویستییەکانی هەڵدەگرێت، ئەم کارەش بەرێکەوتن لە نێوان خاوەن پارەکەو بانکەکەدا دەبێت.

٣. سپاردە بۆ ماوەیەك (الودائع لآجل):

ئەو برەپارەیەیە کە لە بانکی ئیسلامیداو بۆ ماوەیەك دادەنرێت، سپاردەکە لە ژێرچاودێری بانکەکەدا دەبێت، ئەو ماوەیە خاوەن سپاردەکە، ناتوانێت سپاردەکەی بکێشێتەوە، یان بریکارێکی خاوەن سپاردەکە وەبەرهێنانی پێوە بکات، یاخود بەشێوازی جۆراوجۆر بیدات بە کەسێك وەبەرهێنانی پێوە بکات.

٤. حەواڵە: خزمەتگوزارییکە. بانکە ئیسلامییەکان دابینی دەکەن، بۆ نموونە: کەسێك لە بانکێکی ئیسلامی شاری هەولێر برێك پارە دادەنێت، کەسێکی دیکە لە وڵاتی تورکیا پارەکە وەردەگرێت، لەم پێناوەدا بانکی ئیسلامی برێك پارە وەك کرێ ( عموله) وەردەگرێت.

٥. چەك: بریتییە لە بریارێك کە خاوەن چەك، یان خاوەن حسابی بانکی بۆ بانك دەری دەکات، کە برێك لەو پارەیەی لە چەکەکەدا دیاری کراوە، بیدات بە هەڵگری چەکە بانکییەکە، یان بە کەسی سێیەم، هەروەها بانکە ئیسلامییەکان، چەکی گەشتیاریش دەردەکەن (checks traveler).

٦. گۆرینەوە ی دراوی بێگانە: بانکە ئیسلامییەکان، کاری کرینو فرۆشتنی دراوی بێگانە ئەنجام دەدەن، لەم نێوەندەشدا واتە: لە جیاوازیی نرخەکاندا، برێك پارە قازانج دەکەن.

٧. راوێژکاری داراییو لێکۆڵینەوەی ئابووری: بانکە ئیسلامییەکان، لە بەرانبەر برێك پارەدا بۆ پرۆژە ئابوورییەکان، شارەزای داراییو لێکۆڵینەوەی ئابووری دابین دەکەن.

## ئەو کێشانەی رووبەرووی بانکی ئیسلامی دەبنەوە:

١. پەیوەستنەبوون بە دانەوەی قەرزەکان لە کاتی خۆیدا:

یەکێك لە کارەکانی بانکی ئیسلامی، شێوەی (مرابحه) یە کە بەشێکی سەرمایەکەی دەخاتە کار، واتە: بانکەکە کاری کرین بە شێوەی نەختینە پیادە دەکات، پاشان بەشێوەی قەرز، یان بە قسط ( بەش بەش) کاڵاو شمەکانی دەفرۆشێتەوە، زۆرجار ئەم شێوازە، کاریگەریی خراپی لەسەر دانەوەی قەرزەکان دەبێت؛ چونکە بانکەکە ناتوانێت پەیوەست بێت بە وادەو ماوەی دانەوەی قەرزەکانییەوە؛ چونکە قەرزارەکان لە کاتی دیاریکراودا پارەی بانکەکەیان نەگەڕاندۆتەوە، لەم بارودۆخەدا بانکەکە دەتوانێت بەهۆی دواکەوتنی قەرزەکانەوە، داوای قەرەبوو بکات.

٢. چاودێریی بانکی:

ئەم ئاریشەیە، لە کاتی پێدانی زانیاری بە بانکی ناوەندیدا روو دەدات، کاتێك بانکی ناوەندی، داوای راپۆرتی ساڵانە حساباتی کۆتاییو راپۆرتی خولاو « الحسابات الختامية والتقارير الدورية» لە بانکە ئیسلامییەکان دەکات؛ چونکە لە میانەی ئەو راپۆرتو زانیارییانەوە توانای دارایی، گۆرمەی نەختینە، چۆنێتیی دابەشکردنو بەگەرخستنی سەرمایەی بانکە ئیسلامییەکان پیشان دەدات، کە دواتر وەك زانیاریو داتا بۆ بانکی ناوەندی دەخرێنە روو.

نێتۆرک مارکێتینگ

## سەرکەوتن، یان شکست لە ٩٠ ڕۆژی یەکەمدا

و: ئانا هەورامی




# بەڵێن «پێویستیی سەرکەوتن»

هیچ ڕێگایەکی نێوەندگیر، یان "ڕەچەتەیەکی ئەفسووناوی" لە NMدا بوونی نییە. سەرکەوتنی تۆ بەستراوە بە پێوەری بەڵێنت بۆ ئەم بازرگانییە. هەرچەند بەڵێنو وابەستەیی زیاترت هەبێتو کۆششی زیاتر بکەیت، لە سەرکەوتنێکی زیاتریش بەهرەمەند دەبیت. بەپێی "یاسای سرووشتی دانەوەی پارە"، تۆ بە ئەندازەی کۆششت، داهاتت دەبێت. لە ڕاستیدا هیچ ڕێگایەکی نێوەندگیر بوونی نییە.

بەڵێن بریتییە لەم بابەتەی خوارەوە:

**١- کات:**

تۆ ناچاریت کاتێک تایبەت بکەیت بە کارەکەتەوە. زۆربەی کەسەکان بەشێوەی پارت تایم کار دەکەن. بەڵام بەم حاڵەوە، ئەگەر بتەوێت سەرکەوتوو بیت، پێویستە "هۆش و زەینێکی فری تایم"ت هەبێت. ئەمە بە واتای تەواوی کات، کارکردنە، تەنانەت لە بارودۆخێکدا کە کاتت سنووردارە. بۆ گەیشتن بە ڕادەیەك لە سەرکەوتن لە NM، پێویستە لانی کەم، لە هەفتەیەکدا ٢٤ کاتژمێری بۆ تەرخان بکەیت. هەمان ئەو کاتە سنووردارەشی کە ئێستا بەسەری دەبەن، "هێڵێکی لوولەیی" بەرهەم دەهێنێت کە ئایندەت فەراهەم دەکات. ئەگەر دەتوانیت چەندین کاتژمێر لە هەفتەکەتدا بە کەسانی تر بفرۆشیت، دڵنیام

که شایستەیی پێویستت هەیە کە بەشێك لە کاتەکانت بۆ خـۆتو خانەوادەکەت بخەنە لاوە هەتا خەونێکی گەورەتر بکەیتە پراکتیکی.

بـە جددییەتێکـی تـەواوەوە ٣٠ ڕۆژ صەرفـی ئەم کارە بکەیـت، بەڵێن دەدەم کە خووی پیـوە بگریت. خوویەك بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتنێکی هەمیشەیی لە ژیاندا!

**٢- پارە**

**NM** بازرگانییەکـە. هـەر بازرگانییـەك پێویستـی بە وابەستەییو بەرپرسیارێتی دارایی هەیە. ئەگەرچی ئەندازەی پێویستی دارایی لەم بازرگانییەدا بە بەراورد لەگەڵ بازرگانی کۆنـدا زۆر کەمتـرە، بەڵام هەر پێویستـە بڕێـك پارەی بۆ خەرج بکرێت.

بۆ دەسـتپێکردن، پێویسـتت بە هەندێك ئامێرو هۆکار دەبێت. هاتوچۆت دەبێت. پێویستە ئەم خەرجییانە لەئەستۆ بگریـتو دڵنیام ئەگەر ئەو بەرپرسـیارێتییە هەڵبگرن، لەم پێویسـتیانەوە دەسـتکەوت گەلی گەورەت دەبێت، هەڵبەتە خەرجی بۆ هەموان، بەپێی باری دارایی کەسـەکان، یەکسان نییـە. بـەڵام هەرچۆنێـك بیـت، بەرپرسـیارێتیی دارایی پێویستییەکی داراییە.

**٣- لەخۆبوردوویی**

شـتێکی روونە کە بۆ پێشکەوتن لە ئایندەدا، پێویستە حاڵی حازر لە زۆر شت بگوزەرێیت. ئەگەر تەلەفزیۆن زیانی پـێ گەیاندوویت، پێویسـتە ئێسـتا کاتێکی سـنووورداری بۆ دابنێیت. ئەگەر عاشـقی راوە ماسـی، یان گۆڵفیت، ناچاریت هەندێـك لە خۆبوردوویی بنوێنیت؛ تا لە ئایندەدا لەجێیەك راوە ماسـی بکەیت، یان لە سانت ئاندرۆ یاری گۆڵف بکەیت. هەمـوو گۆڕانکارییـە لـە خۆبوردوویەکان لە دەسـتپێکدا نارەحەتکـەرن. هـەروەك کـە زیگ زیـگلار(Zig Ziglar) گوتویەتی: "تۆ بەهایەك بۆ دیاریکردنی ئامانجەکەت نادەیت، بەڵام لە بەرامبەردا لەسـەر پشکی گەیشتن بە ئامانجەکەت سـوود دەبێت." خۆت لە حاڵی گەیشـتن بـە ئامانجەکەتو هەبوونی ئەو شتە وێنا بکەیت، بە دڵنیاییەوە لە سەختییەکان تێپەڕ دەکەیتو بە مەبەستەکەت دەگەیت.

ئارەزوو، دەسـتپێکی هەر بەدەستهێنانێکی گەورەیە. ئایا حەزێکـی زۆرت بۆ گۆڕانکاریو بەدەسـتهێنانی سـەرکەوتن هەیە لە ژیاندا؟ ئەگەر ئەم حەزانە لە تۆ پشکووتبێت، هیچ شتێك ناتوانێت بتوەستێنێت.

تەنها کەسێك کە دەتوانێت ڕێگرت بێت، خودی"خۆت"ە. براکانی رایت حەزیان لە هەڵفڕین بوو، یەکەمین فڕۆکەیان درووسـت کـرد. ئـارەزووی تۆماس ئەدیسۆن ئەوەبوو کە ڕۆژێـك دونیا ڕووناك بکاتەوە، گڵۆپـی داهێنا. دۆزەرەوانو داهێنەرانی گەورە، هەمیشـە ئارەزوویەکی گەورەیان هەیەو هیچ کاتێك بە وشەی"ئەستەم" ڕازی نابن. ئەوان ڕووبەڕووی سەختییەکان دەبنەوە، بەڵام دەست لە کۆششکردن هەڵناگرن. ئەگەر تـۆش حـەزی زۆرو بەڵگەی کافی بـۆ ئەنجامدانی کارێك لە خۆتدا هەسـت پـێ دەکەیت، بە دڵنیاییەوە ڕێگای خۆت پەیدا دەکەیتو سـەرکەوتوو دەبیت. هەڵبەتە دەبێت ئـەم حەزو ئارەزووە بگۆڕیت بە وەسوەسـەی فیکری. هیچ ڕێگایەکی گەڕانەوە نییە! ئەگەر شێوازی بیرکردنەوەت ئەمە بێت، بەدڵنیاییەوە سـەرکەوتنێکی گەورە لە **NM** بەدەست دەهێنیت. لەسەر پەڕەیەکی کاغەز هاندەرو بزوێنەرەکەت بۆ سـەرکەوتنو ئامانجەکانت بنووسە. هەمیشە بیخوێنەرەوەو ئارەزووەکانـت بەبیـری خـۆت بهێننـەرەوە. سـەرکەوتن بەسـتراوە بە هەڵبـژاردنو گۆڕانکارییـەوە، ڕزگاربوون لە خـووە خراپـەکانو قەبولکردنـی ئەو خووە باشانەی کە پێویستی سەرکەوتنن.

ئەگەر خوازیاری گەیشتن بەسـەرکەوتنیت، پێویستە لە شـەڕی خووە خراپەکانت ڕزگاربیبیـتو لەبری ئەوان خووی باش بگریت. بەقسەی دکتۆر ماکسوێل ماڵتز، لەماوەی ٢١ ڕۆژدا دەتوانرێت هـەر خوویەك بگۆڕدرێت. لەبەرئەوە، پێشـنیار دەکەم کە پێرستێك لەو خوویانەی کە دەتەوێت بیانگۆڕیتو ئەو خووە باشـانەی کە دەتەوێت بەدەستیان بهێنیت، ئامادە بکەیت. هەرجارەو خوویەك هەڵبژێرەو ڕۆژێك کاری لەسـەر بکەیت؛ تا وردە وردە بکەونە سەر ڕێگەی سەرکەوتن.



# گوڵی بەختەوەری

لە دێرزەمانـدا لاوێکی هەژارو بێکارو کەمدەرامەت لە لە گوندێکی دوورەدەست دەژیا، ئەم لاوە بۆ گەڕان بە دوای کارێکدا، هاتە نێو شار، زۆر گەڕا، ماندووبوو لە گـەڕان، ڕۆژێك نا، دووان، سیان، ... هتد، بەڵام کارێکی دەست نەکەوت..

چەنـد ڕۆژێك تێپەڕی، ڕۆژێکیان لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ ماڵ، پێیەکانی هەڵخلیسکاو کەوتە سـەر زەوی، کە ویستی هەستێتەوە، گوڵێکـی زۆرجوانی بەدی کرد، گوڵەکە لەوە دەچوو تازە کەوتبێتە سـەر زەوی، تازە بوو، نەشەمزابوو، گوڵەکەی هەڵگرتەوەو کەوتەوە سەر ڕێ بەرەو ماڵ..

لە ڕێگەدا گەیشت بە پیاوێك، منداڵێکی بچکۆلانەی بە باوەشەوە بوو، منداڵەکە ئاماژەی بۆ گوڵەکەی دەستی لاوەکە کردو بە باوکی گـوت: کە ئەو گوڵـە جوانەم دەوێت.. باوکی کـە نەیدەزانی چۆن داواکاریی منداڵەکە بە لاوەکە بڵێت، لەو کاتەدا لاوەکە کە هەسـتی کرد، منداڵەکە ئەو گوڵەی دەوێت.. گوڵەکەی پێشکەشـی منداڵەکە کرد، ئەوانیش زۆر سوپاسـیان کردو دەبەیەك ئاوی خواردنەوەیان پێبەخشی.

لاوەکە لە ڕێگە بەردەوام بوو، دووبارە گەیشـت بە پیاوێك کە دیـار بوو، زۆر مانـدوو تینوو بوو، گەرما برسـتی لێ بڕیبوو، لە ڕێبـوار دەچوو، دیاربوو لە ڕێیەکـی دوورەوە هاتبوو، لاوەکە دەبە ئاوەکەی بەخشی بەم ڕێبوارە ماندووەکە!

ڕێبوارەکـە ئاوەکەی خواردەوەو تینوێتی شـکا، زۆر سوپاسـی لاوەکـەی کـرد، لـە پاداشـتی ئـەو چاکەیەی دەسـتی کـرد بە جانتاکەیـداو ملوانکەیەکـی دەرهێنا، لاوەکـە زۆر بە لایەوە جوان بوو، بەسەرسوڕمانەوە گوتی: ئەوە چییە؟

ڕێبوارەکـەش گوتـی: ئـەم ملوانکەیە هی کچی پادشـایە، لێی کەوتووە، من ناتوانم بۆی ببەمەوە، بەڵام تۆ دەتوانی ئەم ملوانکەیەی بۆ ببەیتەوە، شـازادە ئەم ملوانکەیەی زۆر لا بەنرخە، ناوی شازادە لەسـەر ملوانکەکـە نووسـراوە، لاوەکـەش زۆر بەخۆشـحاڵییەوە ملوانکەکـەی وەرگرتو بـۆ یەکەمجار ملی ڕێگەی بەرەو کۆشـکی پادشـا گرتەبەر، سـڵاوی لە پاسـەوانەکان کردو مۆڵەتی خواسـت بـۆ بینینی شـازادە.. ئەوانیش کـە زانییان ملوانکەکەی شـازادەی هێناوەتـەوە، ڕێگەیـان دا بچێتە لای شـازادە.. لاوەکە ملوانکەکەی پێشکەشی شازادە کرد!

شازادە بە بینینی ملوانکەکەی زۆر دڵخۆشبوو، بەسەرسامییەوە پرسی: تۆ ئەم ملوانکەیەی منت لە کوێ دۆزیوەتەوە؟!

لاوەکـە چیرۆکی دەسـتکەوتنی ملوانکەکەی لە سـەرەتاوە بۆ گێڕایەوە!

شازادە زۆر سوپاسی کردو گوتی: لەبەرامبەر ئەم دەستپاکییەتدا چیت پێویستە داوا بکە، تا پێت ببەخشم!

لاوەکەش گوتی: بۆئەوەی بە دەسـتپاکی بمێنمەوە پێویستم بە کارێکـە؛ چونکە من هیـچ کارم نییەو چەند ڕۆژێکە بەدوای کاردا دەگەڕێم!

شـازادەش گوتی: لەمڕۆ بەدواوە، تۆ لە نێو ئەم کۆشـکەدا کار بکـەو مانگانە مووچـەی خۆت وەربگـرە! لاوەکەش لە خۆشـیدا نەیدەزانی بگری، یان پێ بکەنێت، دەستی کرد بە کارکردنو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر زیرەکیو لێهاتوویی و دەستپاکی خۆی دەسەلماند.. منداڵـە چاوگەشـەکان، دەزانن لاوەکە چۆن توانـی بگاتە نێو کۆشکو لەوێدا پەرە بە دەستپاکیو زیرەکیو لێهاتووییەکانی خۆی بدات؟

بێگومان لە ڕێگەی بەخشـینەوە بوو، کەواتە: تۆش ببەخشەو دڵنیابە هەر لە دنیا پاداشتەکەی وەردەگریت!

بەخشـینی گوڵێك، ئەم لاوەی گەیاندە کۆشـکی پادشا، کەواتە: تـۆش هیچ کات، هیچ شـتێك بەکەم مەزانە، بەخشـین گەورەیە، ئەگەر خەندەیەکیش بێت!



# جیهانی ئینتەرنێت

ن: د. حسان شمسی پاشا
و: یەحیا محەممەد عەلی

**١. وریای زێدەڕۆییکردنبە لە متمانەبوون بە ئینتەرنێت:**

سەرەڕای ئەو پێشکەوتنە دیارەی شۆڕشی تەکنەلۆجیا هەڵی گیرساندووە لە جیهاندا، وەلێ بەکارهێنانی ئینتەرنێت وەك جۆرەکانی تری تەکنەلۆژیا، کاریگەریی زۆری هەیە لەسەر بوارەکانی تەندرووستیو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریو ئابووری.

لەگەڵ بەرەوپێشچوونی شێوازی ژیاندا، بەکارهێنانی ئینتەرنێت لەلایەن مرۆڤەوە، وەك سەرچاوەیەکی گرنگی بەدەستهێنانی زانیاری زیادی کردووە. بە جۆرێك زۆر خەڵك ئینتەرنێت بەسەرچاوەی بنچینەیی بەدەستهێنانی زانیاری دەزانن، هەوڵ دەدەن ڕووبەڕووی هەر پرسیارێك بوونەوە، هانا بەرنە بەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەیانو لە ئینتەرنێت بە دوایدا بگەڕێن.

بەڵام پێویستە وریا بینو خۆمان بەدوور بگرین لە زێدەڕۆیی متمانەبوون بەم سەرچاوەیە، دەبێت بزانین مەرج نییە هەموو زانیارییەکانی تەواو بێت!!

پێویستە بەدوای سەرچاوەی باوەڕپێکراودا بگەڕێینو بزانین لەکوێوە زانیارییەکان وەردەگرین.

لە هەمووی مەترسیدارتر ئەو هەموو زانیارییە ناڕاستو بێبنەمایەیە، کە لەبارەی تەندرووستیی بڵاو دەکرێتەوەو چەندان کەسی ناپسپۆڕ، چەندین بابەتی هەڵە بڵاو دەکەنەوەو خەڵکیش دەبن بە قوربانیی ئەو زانیارییە هەڵانە!

**٢. کاریگەرییە خراپەکانی زۆر بەکارهێنانی ئینتەرنێت:**

ماندوێتیو ناڕەحەتیی جەستە.

سەرئێشەو ئازاری نیوەی سەر (شەقیقە).

کەمخەوییو تێکچوونی خەو.

چاوئێشە، ئازاری بڕبڕەی پشتو جومگەکانو بەشەکانی دیکەی لەش.

زیادبوونی کێش، لەبەرئەوەی چەندین کاژێر دادەنیشێتو ناجووڵێت، لە ئەنجامدا کێشی زیاد دەکات.

کێشەی ئالوودەبوون بە ئینتەرنێتو تێکچوونە دەروونییەکانی لە ئەنجامی خراپ بەکارهێنانی ئینتەرنێتەوە ڕوو دەدەن، وەك: نیگەرانیو چەندانی تر.

**٣. ئالوودەبوون بە ئینتەرنێت:**

واتە: زیادەڕۆیی لە بەکارهێنانی کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت بەبێ هۆکارو پاڵنەرێکی دیاریکراو، تا وای لێ دێت کەسەکە بەردەوام بەلایەوە دادەنیشێت، باجەکەشی کاروباری ڕۆژانەیو خوێندنو ژیانی خێزانی دەیدات!

توێژینەوە دەروونییەکان ئەوە دەر دەخەن، زیاد بەکارهێنانی ئینتەرنێت، دەبێتە هۆی ئالوودەبوونێکی دەروونیو وا لە کەسەکە دەکات، نەتوانێت لێی دەرباز بێت. ڕەنگە لە کۆتاییدا سەربکێشێت بۆ جۆرەکانی دیکەی ئالوودەبوونی وەك سایتە سێکسییەکانو کڕینو بازاڕکردن لەڕێی ئینتەرنێتەوە، دواتریش لەدەستدانی کارو دارمانی خێزانی.

زیانی گەورەش بەر پەیوەندی هاوسەران دەکەوێت لەبەرئەوەی کاتێکی زۆریان دەڕواتو کاتێکی کەمیان دەبێت بۆ پێکەوەدووانو لە ئەنجامدا دڵانیان لێك دەترازێت!

**٤. ڕێگاکانی دورکەوتنەوە لە کێشە تەندرووستییەکانی بەکارهێنانی ئینتەرنێت:**

ڕۆژانە کاتێکی دیاریکراو دابنێ بۆ دانیشتن لەسەر ئینتەرنێت، با لە (٣ کاژێر)زیاترنەبێت.

ئامانجت لە بەکارهێنانی ئینتەرنێت دیاری بکە، پێشتر پلانێك دابنێ بۆ بەکارهێنانی.

بیر بکەرەوە لە شێوازی گەیشتن بە ئامانجەکەت بە کورتترین ڕێگاو کەمتریین ماوە.

خۆت سەرقاڵ مەکە بە شتە لاوەکیو کات بەفیڕۆدەرەکانەوەو سەرنجت بخەرە سەر ئامانجەکەت.

خۆت بەدوور بگرە، لە بەکارهێنانی ئینتەرنێت بۆ خۆشیو کات بەسەربردن بۆ ماوەیەکی زۆر.

کاروبارە کۆمەڵایەتییەکانت بخەرە پێشو کێشەکانی ژیانی ڕۆژانە فەرامۆش مەکە.

واباشە هەموو (٢٠ خولەك) جارێك پشوو وەربگریت، لەڕێی ڕوانین بۆ دوورترین خاڵی ژوورەکە، یان لە پەنجەرەکەوە، بۆماوەی نیو خولەك، یاخود لەڕێی جارجارە داخستنو ترووکاندنی چاوەوە بۆ پاراستنی چاو لە وشکبوونەوە.

دوور بکەوەرەوە لە بەکارهێنان بۆ ماوەی (٣ کاژێر)بەسەریەکەوە.

ڕۆژانە وەرزش بکە لە دەرەوەی ماڵەوە.

چاودێریی بەکارهێنانی ئینتەرنێت بکە لەلایەن منداڵانەوەو ئاڕاستەیان بکە؛ تا سوودی هەیە بۆیان..



# ئەو خواردنانەی کە نابێت بخرێتە ناو بەفرگرەوە

## بەشی یەکەم

زۆربەمان بۆ پاراستنی خواردنەکانمان لە تێکچوون، پەنا دەبەینە بەر ئەوەی خواردنەکە بخەینە ناو بەفرگرەوە، جا خواردنەکە (میوە بێت، یان سەوزە، یان نان) ، بەڵام شارەزایانی خۆراك هۆشیاری دەدەن لە هەندێ خواردەمەنی، کە بخرێنە ناو بەفرگرەوە، ئەوانیش:

### ١. پیاز

پیاز کاتێك دەخرێتە ناو بەفرگرەوە، زۆر بەخێرایی تێك دەچێت، بۆیە باش وایە نەخرێتە ناو بەفرگرەوە.

### ٢. مۆز

نزمیی پلەی گەرمی، هۆکاری وەستاندن، یان هێواشکردنەوەی کرداری پێگەیشتنە لە مۆزدا، کاتێك دەخرێتە ناو بەفرگرەوە.

### ٣. پەتاتە

نزمیی پلەکانی گەرمی، لەوانەیە زۆر بەخێرایی لە پەتاتەدا ببێتە هۆی گۆڕینی نیشاستە بۆ شەکر، بۆیە پێویستە پەتاتە لە دەرەوەی بەفرگرو لە شوێنێکی وشكو ساردو تاریکدا دابنرێت.

### ٤. سیر

هەڵگرتنی سیر لەناو بەفرگردا، دەبێتە هۆی تێکچوونی بەشی ناوەوەی، هەرچەندە بەشی دەرەوەی دەپارێزێت، بەڵام ناوەوەی تێکدەدات.

### ٥. نان

ساردی بەفرگر دەبێتە هۆی وشکبوونەوەی ئەو شلەمەنییەی کە لە نانەکەدا هەیەو نەرمییەکەی ناهێڵێت، ئەمەش وای لێ دەکات، جوینی زەحمەت بێت.

### ٦. ئەفۆگادۆ

ئەگەر ئەفۆگادۆکە بە تەواوی نەگەیی بوو، باش وایە نەخرێتە ناو بەفرگرەوە، بە هەمان شێوەی مۆز، کرداری پێگەیشتنی هێواش دەکاتەوە.

### ٧. هەنگوین

دەتوانرێت هەنگوین بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە قاپێکی سەرداپۆشراودا هەڵبگیرێت، بێئەوەی تێك بچێت، بەڵام بە خستنە ناو بەفر گرەوە، دەنکۆڵەکانی شەکرەکە دەبن بە کریستاڵو ئەو کاتە خواردنی زۆر زەحمەت دەبێت.

### ٨. ڕەیحانە

ڕەیحانە کاتێك دەخرێتە ناو بەفرگرەوە سیس دەبێتو کار دەکاتە سەر بۆنو بەرامی خواردنەکانی تری ناو بەفرگرەکە، باش وایە بخرێتە ناو پەرداخێك ئاووەو لە سەر مێز، یان هەر شوێنێکی چێشتخانەکە دابنرێت.



# ڕاستییەکان سەبارەت بە شەکر

سێوە جاف

لێکۆڵینەوەکان ئەوەیـان دەرخسـتووە، کـە بەرزبوونەوەی ئاستی شـەکر لە لەشدا، دەبێتە هۆی لەناوبردنی جگەرو دەبێتە هـۆی تێکدانـی زیندە کـردار، فەرمانی دەماغیـش لاواز دەکات، هەروەها دەبێتە هۆکاری تووشـبوونمان بە نەخۆشییەکانی (دڵو شەکرەو شێرپەنجە).

### شەکرو قەڵەوی:

شـارەزایان جەخت لەسـەر ئەوە دەکەنەوە، کە زۆرخواردنی شەکر، دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی کۆبوونەوەی چەوری لە لەشـدا، هەروەها جگەر زیندە کردار ئەنجام دەداتو شەکری زیاد لە پێویسـت لە لەشدا دەگۆڕێت بۆ چەوری، ئەگەر بێتو چەوری لـە جگەردا زۆر بێت؛ ئەوا بەرگری لـەش زیاد دەکات بەرامبەر هۆڕمۆنی ئەنسۆلین.

### شەکرو شێواوی لە هۆشو بیردا:

زۆر خواردنی شـەکر، دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی پەیوەندی لـە نێوەن خانەکانـی دەمـارە ڕاگەیاندن لەگـەڵ یەکتریدا، کە ئەمەش توانای بەبیرهاتنەوەمان کەم دەکاتەوەو کار دەکاتە سـەر چۆنێتیی مامەڵەکردن لە دۆخە جیاوازەکان.

### شەکرو پێست:

بەهەمان شێوەی جگەرەکێشـانو تیشکی سەروو وەنەوشەیی، شەکریش کاریگەری هەیە لە دەرکەوتنی نیشانەکانی بەساڵاچوون لەسـەر پێسـت، کاتێك دەبێتـە هـۆی تێکشـکاندنی خانەکانی پێسـت، خانەکان خۆیان، خۆیان بونیـاد دەنێنەوە، بەڵام لەکاتی بەرزبوونەوەی ئاسـتی شەکر لە خوێندا، گەردەکانی شەکر لەگەڵ گەردەکانی ترشی ئەمینیدا یەك دەگرن، کە ئەمەش دەبێتە هۆی بونیادنانی نادرووستی خانەکان، ئەمەش بەپێی کات دەبێتە هۆی دەرکەوتنی نیشانەکانی بەساڵاچوونی پێش وەخت لەسەر پێست.

### شەکرو لاوازبوونی ماسوولکەکان:

ماسـوولکە وزە لـە نیشاسـتە وەردەگرێ؛ چونکە نیشاسـتە دەگـۆڕێ بۆ گلوکـۆز، بەڵام خۆراکە سـووکە لەقوتونراوەکان، کە لـە کارگەکان دەفرۆشـرێن، لە فرەکتۆز پێکهاتـوون، کە ئەمیش جۆرێکە لەشـەکر، جگەر مامەڵەی لەگەڵـدا دەکات، نەك لەگەڵ ماسـوولکەکان، ئەمـەش دەبێتە هۆی هەڵئاوسـانو سـکچوونو هەروەها دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی توانای مرۆڤ بۆ وەرزشکردن.

### پێویستە چی بکەیت؟

زۆر کات حەز بە خواردنی شیرینی دەکەین، لەو کاتانەی ئەم جۆرە هەسـتەت بۆ درووست دەبێت؛ ئەوا کێشە لە خواردنی دوو پارچە پسکویت لە هەفتەیەکدا درووست نابێت، یان دەتوانیت لە زۆربەی ڕۆژەکاندا ژەمێك لە شۆفان بخۆیت کە شیرین کرابێت بە کەوچکێك شـەکری قاوەیی، شۆفان هەستی تێریت لەلا درووست دەکاتو کەوچکە شەکرەکەش دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی ئاستی هۆڕمۆنی سیرۆتۆنین بە شێوازێکی ئاسایی.

پێش ئەنجامدانی وەرزش، خواردنی ژەمێکی سـووك کە پێك هاتبێت لە گلوکۆز، ( نەك فرەکتۆز) بەسوودەبێت .

مێخەكو زەنجەفیلو سـیر، زۆر بخۆ؛ چونکە هەموو ئەمانە دەبنە هۆی هێواشکردنەوەی کرداری درووستکردنی بەندەکەن لە نێوان شەکرو ترشە ئەمینییەکان.

لە کۆتاییدا، خۆت بپارێزە لە خواردنی شـیرینی، بەپێی تواناو لە جێگایان میوەو شەربەتی سرووشتیو هەنگوینی سرووشتی بخۆ.

# دڵی سپی!

کیژان فەرەج

زستانی ئەمساڵ جیاواز لە هەموو زستانانی تر، هێندەی تاسەی بەفر بووم ببارێت، هێندە بە تاسەی بارانەوە نەبووم! لەلام سەیربوو، منێك هەموو ساڵێك لە هاوینەکەشیدا ئارەزووی بارانبارینم دەکرد، چۆنە ئەمساڵ ئاواتمە بەفرێکی زۆر بباریێو تێر بە چاوانم، سەیری دونیای سپی بکەم!

ئاخر ڕەشیی تاوانەکانو خراپەکارییەکانی مرۆڤ لەسەر زەوی، هێندە دونیایان لە بەرچاو ڕەش کردبووم، کە ئیدی گاڵتەم بە ناوێك دەهات، کە پێیان دەگوت مرۆڤ!

کە منداڵ بووم، ترسم لە پشیلەی ڕەش هەبوو، ئێستا ترسم لێی نەماوە؛ چونکە هەر لە منداڵییەوە خوشکە گەورەکەم، هەموو کات پێی دەگوتین: (ئێمە مرۆڤینو ئەوان لە ئێمە دەترسن، نابێت ئێمە لەوان بترسین! چونکە ئەوان توانای هیچ شتێکیان نییە بەرامبەرمانو ناتوانن ئازارمان بدەن!)، من چوزانم شتی سەیرتر هەیە لە ژیاندا، کە دەتوانێت بەرز ببێتەوە لە باشیدا بۆبەرزتر لە فریشتەکان! دەشکرێت نزم ببێتەوە بۆ خوارتر لە هەر دڕندەیەك، کە بە خەیاڵتدا دێت!

من چوزانم مرۆڤ بونەوەرێکی هێندە سەیرە!

ئاخر ئەو کات هەموو مرۆڤەکان لەلام تەنها خێزانێکی خنجیلانەو چەند هاوڕێیەکی قوتابخانەو کۆڵانم بوو.

هەموو خەونم یارییەکی جۆلانێو خەتخەتێن بوو!

وام دەزانی ژیان جگە لەخۆشی، هیچ شتێکی تر نییە! جگە لە دۆستایەتیو خۆشەویستی هیچی تر نییە، جگە لە سۆزو میهرو وەفا، هیچ پێناسێکی تری نییە!

نەمزانیبوو، کە مرۆڤەکان گەورە دەبنو خۆیانن بڕیار لەسەر مرۆڤانە ژیانو نامرۆڤانە ژیانی خۆیان دەدەن، دەیانەوێت وەك بەفر سپی بێت ژینیان، یان وەکی شەو تار! دەیانەوێت گوڵاوپرژێنی سۆزو میهرو وەفا بن، یان چێنەری تۆوی ڕقو کینە! دەیانەوێت باوەشێك بن بۆ ئارامکردنەوەی ڕۆحە ماندووەکان، یاخود تێکدەرێك بن بۆ کەسە هەستناسکەکان!

دەیانەوێت دەروونیان وەك بەفر سپی بێت، یاخود وەکی خەڵوز، سینەیان ڕەش بێت!

شەیدابن بە ڕووی لالەو نێرگزو وەنەوشەو شەوبۆ، یان سەرمەست بن بە بۆنی پارەو سووو درۆ؟

ئازیزم، تۆیەکی بە نرخ کە ئەم نووسراوەم دەخوێنیتەوە، دڵنیام وەك من لە خەمی گەڕاندنەوەی بەهاو شکۆی مرۆڤەکاندایت، چوون وا نەبووایە، تاقەتت نەبوو بگەیتە کۆتایی ئەم نووسینەم.

وەلێ، تکای مرۆڤانەم لێت هەیە، داوات لێ دەکەم ئاگاداری ئەو سیفەتە بەرزو ئاکارە جوانانەت بە، کە تا ئێستا تیاتدا هەیەو هەرگیز دەستبەرداریان مەبە بەبیانووی ئەوەی ژیان گۆڕاوەو ئێمە لەناو دەچین، گەر وا باش بین (میهرەبانو بەسۆز بینو ڕێز لە بەرامبەر بگرینو وەفامان هەبێت، سوو نەخۆینو ... هتد)، دەزانم ئەم تکایەم قورسە، وەلێ بۆ تۆ نا! بۆ ئەوانەی دڵیان خەریکە سپێتی لەدەست دەدات، بۆ ئەوانەی تەنها لەم دونیایان دەڕواننو وا تێ گەیشتوون کە دەبێت هەقی هەر مرۆڤێك، تەنها لەم دونیا کاتییەدا بدرێتەوە.

دەڵێیت چی؟ بەڵێنت دا؟ نا، نا، دوودڵ مەبە. دڵنیابە هەر خۆتیت دەبیتە براوە لە ژیانداو سپێتییەك بۆ سەر دڵت زیاد دەکەیتو ڕەشییەکی تاوانی پێ دەسڕیتەوە...

تکات لێ دەکەم، با چیدی نەبینە هۆکار بۆ زیاتر ڕەشکردنی دونیامان، با بۆ نەوەکانی داهاتوومان ببینە ئەو بەفرەی هێمن هێمن دەبارێو لە دوای خۆی بەهارێکی پڕ نێرگزو گوڵاڵەسوورە دەهێنێت!






# ژیان چی فێرکردم

ئیکارت تۆلی: Eckhart Tolle　　عبدالغفار سابیر

ئیكارت تۆلی: Eckhart Tolle خاوەنی پڕفرۆشترین كتێبی شاری نیویۆركە لە ئەمریكا لە ساڵی ٢٠١٠.

كتێبەكەی خۆی (Power of Now) هێزی ئێستا،

ئەو كتێبە بۆ ٣٣ زمانی جیهان وەرگێڕدراوە، لەو كتێبەدا نووسەر باسی جیهانێكی تازە دەكات، كە پڕە لە جوانیو هەر یەك لە ئێمەش، پێویستە ئەو جیهانە بدۆزینەوە كە لە هەموان نزیكە؛ چونكە لە ناخماندایە:

نووسەر بەو شێوەیە باس لەو جیهانە دەكات:

١- سواڵكەر تەنها ئەوانە نین، كە داوای پارە دەكەن، بەڵكو جۆرە سواڵكەرێكی تریش هەیە، كە وێڵە بەدوای بەختەوەریو لە دوای خۆشیدا دەگەڕێ، نازانێ وا گەنجینەی بەختەوەری لە ناخی خۆیدا هەڵگیراوە.

٢- چەمكی (بوونم لە ژیان) دەتوانرێت بكرێتە بابەتێكی زۆر سەرنجڕاكێشو تایبەتو ببێتە كۆڕی مەیدان، نەك تەنها بیرۆكەیەكی ناو مێشك بێت، كە من هەمو تەواو.

٣- زۆر جار خۆمان كۆتوبەند دەكەین، بە چەند بیرۆكەو لێكدانەوەیەك لەناو مێشكی خۆمان، بەڵام دڵنیابە ئەتۆ زۆر لەوە گەورە تریتو توانات زۆر زیاترە لەو بۆچوون لێكدانەوانە، دە كەواتە: خۆت بدۆزەوە.

٤- بیرۆكە بەشێكە لە زیرەكی، دڵنیابە زیرەكی پانتاییەكی زۆر فراوانی هەیە، دە با بیرۆكە لاوازەكان داینەپۆشن.

٥- ئەگەر وردبینەوە لە ڕۆتینی ڕۆژانەمان، دەگەینە زۆر بابەت كە پێی دەگوترێت: داهێنان، یان ناخی زیرەكیو هەنگاوی سەركەوتن.

٦- ئەگەر كەسێكت دۆزییەوە، كە بەڕاستی داهێنەر بوو، شایستەی ئەوە بوو كە بیكەیت بە پێشەنگ؛ ئەوا دڵنیابە بەخۆشت شیاوی ئەوەی كە كەسی پێشەنگو لێزان بدۆزیتەوەو چاوەكانت ڕووناكی بەهێزیان تێدایە.

٧- وا مەزانە سەرچاوەی هەموو ڕووناكییەك لە دەرەوەیە، زۆر ڕووناكی هەیە، سەرچاوەكەی لە ناخی خۆتدایە، بۆیە هەوڵ بدەو بیدۆزەوە.

٨- ئاشنابوون بە ژینگەی دەوروبەر، خودناسییە.

٩- نەمری واتای ئەوە نییە، كات بە كۆتا نایەت، بەڵكو نەمری هەر كاتیشی بۆ نییە. بۆیە "بوون" بە واتای من هەم دێت، بە چاوپۆشی لە تەمەن، یان لە كات.

١٠- لەناو هەموو دەنگەدەنگو جەنجاڵییەك، بێدەنگییەك پێناسەی ئێستا دەكات.

١١- لە ناخی هەموو جوانییەكدا، كە لە ڕووكاری سەرەوەدا، دیارە، پیرۆزییەك هەیە لە قووڵاییدا.





# وەڵامە بەهێزەکانی هەیاسی خاس

* - یەکێک لە هاوڕێکانی ڕووی کردە جەنابی قازیو گوتی: بۆچی لە قەزاواتدا پەلە دەکەیت؟

هەیاسی خاس لە وەڵامدا گوتی: دەست چەند پەنجەیە؟

کابرا گوتی: پێنج.. هەیاس گوتی: بۆچی وا پەلەت کرد، لە وەڵامدانەوە؟

هاوڕێکەی گوتی: لەبەرئەوەی زۆر بە جوانی وەڵامەکەم زانیو پرسیارەکەت زۆر ئاسان بوو. خۆ ئەو پرسیارانە پێویست بە بیرکردنەوە ناکات.

هەیاسی خاس گوتی: هەر ئەوەش وەڵامی منە بۆ تۆ! واتە: ئەو کێشەو داوەرییانەی دێنە لای من، هێندەی ئەو پرسیارە ئاسانە بە لامەوە، ئیدی پێویست بە بیرکردنەوەو تێڕامان ناکات!

* پیاوێک هات بۆ لای هەیاسو پێی گوت: فێری قەزاواتم بکە؟

هەیاس گوتی: قەزاوات فەهمو تێگەیشتنە، دەتوانیت بڵێیت: فێری زانستم بکە!

* کابرایەک بە هەیاسی خاسی گوت: ئەگەر سێ سیفەتت تێدا نەبووایە، لەم جیهانەدا وێنەی تۆی تێدا نەدەبوو!

هەیاس گوتی: ئەو سێ سیفەتە چین؟

کابرا گوتی: کاتێک دوو کەس دێنە لات؛ بۆئەوەی قەزاوات لە نێوانیاندا بکەیت، بەڵگەکانیانت بۆ ڕوون دەکەنەوە، تۆ پەلە دەکەیت لە قەزاواتی نێوانیان.

هەیاس گوتی: چی تر؟

کابرا گوتی: لەگەڵ کەسانێک دادەنیشیت، کە زۆر لە خوار تۆوەن، واتە: شایستەی پلەو پایەی تۆ نین.

هەیاس گوتی: چی تر؟

کابرا گوتی: جلوبەرگێک لەبەر دەکەیت، کە شایستەی شانوشەوکەتو پلەوپایەی تۆ نییە!

هەیاسی بلیمەت ڕووی لە کابرا کردو گوتی: سەبارەت بەوەی من پەلە دەکەم لە قەزاواتدا، من لە تۆ دەپرسم: پێنج زۆر ترە، یان شەش؟ کابرا گوتی: بێگومان شەش! هەیاس گوتی: زۆر بەپەلە وەڵامت دامەوە، هیچ بیرت لە وەڵامەکە نەکردەوە، دەستبەجێ وەڵامت دامەوە؟!

کابرا گوتی: کێ گومانی هەیە، لەوەی شەش زیاترە لە پێنج!

هەیاس گوتی: منیش هێندەی وەڵامەکەی تۆ، دڵنیامو گومانم نییە لەو حوکمەی دەری دەکەم، هەروەکو تۆ چۆن گومانت لە وەڵامەکەت نەبوو!

کەواتە: بۆچی لە گێڕانەوەی مافی کەسێکدا سستی بکەم؟!

سەبارەت بە گوتەی دووەم، کە من لەگەڵ کەسانی خوارخۆم دادەنیشم، لەبەر ئەوەیە کە من لەگەڵ کەسانێک دادەنیشم کە قەدرم دەزانن، ئەمەم پێ خۆشترە لەوەی لەگەڵ کەسانێک دابنیشم، کە قەدرم نازانن..

سەبارەت بە بۆچوونی سێیەم، کە من جلوبەرگێک دەپۆشم کە شایستەی من نییە.. من جلێک لەبەردەکەم کە بمپارێزێ، جلێک لەبەرناکەم کە من بیپارێزم!



# وەڵامی بەجێ

کابرایەکی دەشتەکی گوتی: خودایە لە دۆستەکانم بمپارێزیت! گوتیان چۆن، بۆچی ناڵێیت لە دوژمنەکانم؟ دەشتەکییەکە گوتی: لەبەرئەوەی خۆم دەتوانم لە دوژمنەکانم خۆم بمپارێزم!

پیاوێك بە ئەحنەفی گوت: کەسێکی متمانەپێکراو لە بارەی تۆوە هەواڵی خراپی پێداوم!
ئەحنەف گوتی: کەسی متمانەپێکراو باسی خەڵکی ناکاتو دووزمانی ناکات!

موتەوەکیل بە ئەبوعەینای گوت: چۆن دەڕوانیتە کۆشکەکەمان؟
ئەبوعەینا گوتی: فەرمانڕەوای باوەڕداران، بینیم خەڵکی لە دونیادا خانوو درووست دەکەن، بەڵام تۆ دونیات لە کۆشکەکەتدا درووست کردووە!

پیاوێك بە ڕەقەبەی کوڕی موسقەلەی گوت: بۆچی هێندە زۆر، لە هەموو جێو ڕێیەکدا دەردەکەویت؟
ڕەقەبە گوتی: بۆچی ئەوە، بۆ من بە زۆری دەزانیت، بەڵام بۆ خۆتی بە کەم دەزانیت، لە کاتێکدا بە هەر ڕێگەیەکدا ڕۆیشتبم، هەر بە تۆ گەیشتووم لەو ڕێگەیە!

لە بازرگانێکیان پرسی: بۆچی ئەوەندە پارەو سامانتان خۆش دەوێت، لە کاتێکدا پارەو سامان لە دونیا نزیکتان دەکاتەوە؟ بازرگانەکە گوتی: ڕاستە لە دونیا نزیکم دەکاتەوە، بەڵام هاوکات لە دونیاش دەمپارێزێت.



ئەگەر کتێبخانەیەکو باخچەیەکت هەیە؛ ئەوا تۆ هەموو پێویستییەکانت هەیە.

مارکۆس -دەوڵەتدار-

ئەگەر زستانمان نەبایە، بەهار ئاوا خۆش نەدەبوو!

ئێن دادلی – شاعیر

ئازایەتی توانای ئەنجامدانی کارەکانە، بەشێوەیەکی درووست،
تەنانەت ئەو کاتانەش کە دڵت پڕە لە ترس!

برادلی -جەنەڕاڵ-

ئەگەر دەتەوێت هەڵە نەکەیت، واز لە داهێنانی بیری نوێ بهێنە.

لیۆ بیرنیت -بەڕێوەبەری ڕیکلام-

ئەگەر بۆڵەبۆڵ نەکەیت؛ دەتوانیت بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ بیت.

بێرنارد باروش – ئابووریناس-



# ئێمەو ئیمان

زاهیر زانا

ئیمان سەرچاوەی ئارامیی دڵو ڕوناکیی بیرو هێزی هەنگاوو وزەی خۆڕاگرییە لە ئاستەنگەکاندا، ئیمانو باوەڕ، پێویستیی دڵی مرۆڤن بۆ ژیانێکی شکۆمەندو سەرکەوتوو، باوەڕ واتە: پشتبەستن بە درووستکەری گەردوونو بەهێزترینو فراوانترین دەسەڵاتو چاوەڕوانیی بارینی ڕەحمەتو کرانەوەی دەرگای بەخششی خوداییو هاتنی چارەسەرە لە دڵی تەنگییەکانداو گەیشتنە بە تەختی لەسەر سنگی سەختییەکان، وەرگرتنی وزەیە لە هێزی فراوانی کردگارو چاوەڕوانبوونی بەهارە، لە چلەی وەرزی زستانو هیوای چرۆو چەکەرەیە، لە تۆوی ژێرخاکنراوو درووستبوونی درەختە لە لقی بەخاکچەقێنراو.

باوەڕ ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لە ژیانی مرۆڤداو پێویستییەکی ڕۆحیو دەروونییە وەك ڤیکتۆر هیگۆ دەڵێت: (ئیمان پێویستییەکی مرۆڤەو هاوار بۆ ئەوەی نییەتی). باوەڕ ڕۆڵێکی گەورە دەگێڕێت لە کێشانی نەخشەی کەسێتیی مرۆڤو مرۆڤی خاوەن باوەڕ بەهێزو دامەزراوو پتەوو خۆڕاگرو بەئارامەو دەروونێکی ئاسوودەو بەختەوەری هەیەو وەك دەریا وایە، بەئاسانی لێڵ نابێت وەك درەخت وایە بەخشندەیە، ئەگەر بەریش نەدات، سێبەری هەیە، وەك شاخ پتەوەو گەردەلوولو زریان کاری لێ ناکەن، مرۆڤی باوەڕدار چاکەویستو خاوەن ڕەوشتو ئاکاربەرزەو زیان بە دەوروبەر ناگەیەنێتو دەستی یارمەتی درێژ دەکاتو لەدڵو دەروونیدا خۆشەویستی بۆ هەموو کەسێك هەیە، ئەو کەسەی ئیمان دڵو دەروونی داپۆشیوە، خاوەنی کەسێتییەکی بەهێزو سەنگینەو متمانەی بەتواناکانی خۆی هەیەو تێ دەکۆشێت لەپێناو سبەینێییەکی باشترو ئایندەیەکی ڕۆشنترو هەرگیز لەهەوڵو کۆشش بێتاقەتو بێهیوا نابێتو هەمیشە کەسێکی پڕ وزەو تینەو لەبارو دۆخی ئێستای ڕازییەو هەنگاو بۆ باشتر هەڵدەنێتو لە هەڵەو کەموکورتییەکانی ڕابوردووشی پەند وەردەگرێتو هەوڵو کۆشش دەدات قەرەبوویان بکاتەوە.

ئازیزانم، ئیمان سەرچاوەی ئارامیو ئاسوودەیی دڵو دەروونەو کار لەمرۆڤ دەکات، کە هەمیشە پڕ لە هیواو ئومێد بێتو لەناو جەرگەی گیروگرفتەکاندا خۆڕاگر بێتو بەخۆی بڵێت خودای منو خودای یوسفو ئیبراهیم یەك خودایەو چۆن ئەوانی لەناو بیرو ئاگردا پاراستو بەرزی کردنەوە؛ منیش دەپارێزێتو نارەحەتیو غەمەکان کۆتاییان دێتو دەرگای شادییەکان دەکرێنەوە.

باوەڕ گەورەترین سەرچاوەی وزەیە، کە مرۆڤی ئەم سەردەمە نەیتوانیوە سوودی پێویستی لێ وەربگرێت؛ چونکە باوەڕبوون بەتواناکانمانو بەوەی کە ئێمە سەرداری بوونەوەرانین، هێزێکمان پێ دەبەخشێت کە پەرجووئاسا گرفتەکان ڕادەماڵێتو بیابانەکان دەکاتە گوڵستانو کۆتایی بەنائومێدی دەهێنێتو تۆوی هیوا دەچێنێتو هەنگاومان پێ دەهاوێت بەرەو پێشترو بەرەو باشتر سوودوەرگرتن لەو توانایانەی خوای گەورە پێی بەخشیوینو هانمان دەدات، جێدەستمان دیار بێتو بەرهەمدارو بەکەڵك بینو دووکەڵەکان بڕەوێنینەوەو بەرەو ئاسۆی گەش هەنگاو بنێینو لەپشتی ڕووداوەکانەوە چاوەڕوانی هاتنی خێرو خۆشی بینو بڕوامان وا بێت کە ئێمە لەم دنیایەدا، خەریکی کشتوکاڵینو دونیا باخێکەو ئێمەش باخەوانو دەبێت هەمیشە خەریکی ئاوداشتنو بژارو پەرژین بین؛ تا باخی ژینمان لە دڕندەکان بپارێزینو بەوپەڕی سەلیقەوە، نەمامی بەردارو گوڵی جوانو ڕازاوە لە باخی تەمەندا بڕوێنین.

ئازیزانم، با ژیانمان بەئیمانو باوەڕ بڕازێنینەوەو خۆمانی پێ بەهێز بکەینو دونیایەکی جوانتر بۆ خۆمان بسازێنینو هەمیشە بەباوەڕەوە بژین، تا بەختەوەرو ئاسوودەو دڵارام بین، باوەڕ بەوەی خوای گەورە لەدوای هەموو شەوێك ڕۆژی داناوەو هەموو دەرگایەك کلیلێك هەیە بیکاتەوەو هەموو تەنگانەیەك کۆتاییەکی هەیەو هەموو دەردێك دەرمانێکی هەیە، باوەڕ بەوەی هەموو شتێك خێرێکی تێدایە، با باوەڕمان پتەو بکەینو بزانین ئێمە زۆر بەهێزینو ناکەوین؛ چونکە پشتو پەنامان خودایە.





# بێدەنگی زمانە...

عبدالرحمن مولود

بێدەنگی.. زانستێکی نارەحەتترە لە زانستی قسەکردن. بێدەنگی.. شتێکە زۆر نارەحەتە بۆ هەموان کە ڕاڤەی بکەن. بێدەنگی.. باشترین وەڵامە بۆ هەندێ لە پرسیارەکان. چەندە جوانیت، کاتێک بێدەنگ دەبیت لە شتانێکدا کە پێویستیان بە بێدەنگییە.. چەندە جوانە پێبکەنیت بەڕووی کەسێکدا کە چاوەڕوانی گریانت لێ دەکات.. چەندە جوانە بێدەنگیت بە ڕووی کەسێکدا کە چاوەڕوانی قسەکردنت لێ دەکات.. بەڵێ، بێگومان بێدەنگی زمانێکی بەناوبانگی مرۆڤە بلیمەتەکانە.. دەی با هەمووان بێدەنگ بین. یەک جار لەسەر بێدەنگییەکەمان پەشیمانین.. بەڵام چەندین جار لەسەر قسەکردنەکانمان پەشیمانین.. هەندێ کەس دەڵێن: کەی بێدەنگ بین؟؟ کاتێک دەروونت حەزی لە قسەکردنە. کەی قسەبکەین؟؟ کاتێک دەروونت حەزی لە بێدەنگییە. بێدەنگی.. وزەیەکی بەهێزت پێدەبەخشێت بۆ بیرکردنەوە لە هەموو ئەو شتانەی لە دەوروبەرت ڕوودەدەن، پاشان تەرکیز ژیرانە زیاد دەکات بۆ وەڵامەکانت. بێدەنگی.. وات لێ دەکات کۆنترۆڵی پێشی خۆت بکەیت لە میانی سەرنجە وردەکانتەوە، بەبێ قسەکردن کە وا لەوان دەکەیت سەرسام بن لە ڕاڤەکردنی.. بێدەنگی.. لەگەڵ هەندێک لە جووڵەو ئاماژەدا، وا لە بەرامبەرەکەت دەکات، کە ئەوەی لە ناخیدایە بیدرکێنێت، زیاتر لەوە دەڵێت کە دەیەوێت بیکات.. بێدەنگی.. وا دەکات لە دووژمنەکانت هەست بەڤینی زیاتر بکەن؛ چونکە بە هێرشێکی شاراوەی دادەنێن، ئەو کاتەش بێدەنگییەکەت بەهێزترە بەبێ قسەکردنو ماندووبوون.. بێدەنگی.. باشترین چارەسەرە لەبەردەم کێشە بێبایەخەکانی نێوان هاوسەرەکان.. بێدەنگی.. لە هەڵوێستە سەختەکاندا ڕێز دروست دەکات، بە پێچەوانەی ململانێو جەدەل، کە دەبێتە هۆی درووستبوونی دووبەرەکیو ڕق... بێدەنگی..چەکی ئەوانە تێک دەشکێنێت کە ئاژاوە دەگێڕن لەگەڵت، ناچاریان دەکات کە توانای بەردەوام بوونی قسەکردنیان نەبێت.. بێدەنگی هونەرە: هەوڵ بدە فێری بیتو هەرگیزیش شکست ناهێنیت لە بەدیهاتنی ئەوەی دەتەوێت لە هەر کاتێکدا بێتو لەهەر هەڵوێستێکدا بێت.. بێدەنگ بە؛ چونکە بێدەنگی قسەکردنە!!



# ٧ ئامۆژگاریی زێڕین بۆ ڕزگار بوون لە ڕاڕاییو گوشاری دەروونی

ئا: ناز سەعید

١. واز بهێنە لە بیرکردنەوە لە هەموو ئەو کەسو شـتانەی کە بێزارت دەکەن. ئەگەر ترسـت لە داهاتووت هەیە، بوەستە لە بیرکردنەوە لە داهاتوو، هەوڵ بدە لە ئێستادا بژیت، لەبەرئەوەی ئێسـتا موڵکی تۆیەو لێـرەوە دەتوانیت داهاتووت بونیاد بنێیت. (ئێستا ڕێگەی داهاتووت بۆ دەکێشێت).

٢. گەشبینانە لە ژیان بڕوانەو وازلە بیری خراپو ڕەشبینانە بهێنـە؛ چونکـە بیرکردنـەوەی ڕەشـبینانە، هۆکارێکـی زۆر کاریگـەرە بۆ ڕاڕاییو خەمباریو دوودڵی. بۆیە هەمیشـە بەدەم ژیانەوە پێبکەنەو ئەوە بزانە کە ئاسـوودەیی لە ناخی خۆتەوە سەرهەڵدەدات.

٣. هـەوڵ بدە چێژ لەو سـاتانە ببینیت کە ئێسـتا تێیاندا دەژیتو نرخی ئەو شتانە بزانە کە لە ئێستادا هی تۆنو بیر لەو شتانە مەکەرەوە کە کەسانی تر هەیانەو تۆ نیتن. گەر دەتەوێت بە خۆشـی بژیت؛ بۆ خودی خۆت بەو هەرگیز بەراوردی خۆت مەکە بە کەسانی تر.

٤. گەرچـی ژیانیشـت سـەختو دژوار بێـت؛ هـەوڵ بـدە کاتەکانت لە شـتی بە سـوودا بەسـەر ببەیت فێـری کارێك، یاخود پیشەیەکی نوێ، یاخود زمانێکی تر ببە، یاخود خۆت بە جۆرە وەرزشـێك، یان هونەرێك، یان هەر هیوایەتێکەوە سەرقاڵ بکە، کە لەگەڵ کەسـێتیتدا دەگونجێت. لەوەش باشتر، بەشداری کاری خۆبەخشـانەو خێرخـوازی بکە، کە ئەوە ئاسـوودەیی بە ناخو ڕۆحت دەبەخشێت.

٥. هـەوڵ بدە خـۆت لە گۆشـەگیریی کۆمەڵایەتی بە دوور بگریت؛ چونکە گۆشـەگیریی لە هەندێك کەسـدا، دەبێتە هۆی ئەوەی زیاتر هەست بە خەمباریو گوشارو نیگەرانی بکات.

٦. هەوڵی نزیك بوونەوە بدە لە دروسـتکاری خۆت؛ چونکە بڕوابـوون بـە هێزی باڵادەسـتی ئیلاهـی، ئارامیو سـەکینەت بە ناخو ڕۆح دەبەخشـێتو ئەو هەسـتەت پێ دەبەخشـێت کە توانایەکـی بەهێزت هەیە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی هەموو کێشـەو گوشـارو خەمەکانت؛ چونکە هێزێکی مەزنو باڵا، پشـتیوانیت دەکات.

٧. دەتوانیت بەشـداری کۆڕو سـیمینارو خولی بەهێزکردنی بڕوابەخۆبوونو بەهێزبوون بکەیت، گەر ئەوەش نەکرا دەتوانیت سوود لە خوێندنەوەی ئەو پەڕاوو نووسراوە بەسوودانە ببینیت کـە یارمەتیت دەدەن بۆ بەهێزبوونتو توانای ئەوەت پێ دەدەن کە ڕووبەڕووی کێشەو فشارەکان ببیتەوە.



# ١٠٠ ڕێگا بۆ هاندانی خود

## بەشی سێیەم

**لە ئینگلیزییەوە: هەردی محەممەد**

**٢١. سەرەتا هەستێکی باشت هەبێت:** زۆربەی خەڵك، هەستێکی باشیان هەیە کاتێك هەندێ لە ئامانجەکانیان بەدەست دەهێنن. بە لکاندنی خۆشبەختی بە هەندێ شت کە هێشتا نیتە، تۆ ڕێگری لە خۆت دەکەیت لە بەدەستهێنانی. گەشتێکی خۆش بەسەر ببە لە ڕێگادا، نەك لە کۆتاییدا. بە واتای ئەوەی نابێت لە کۆتایی گەشتەکەتدا. بڵێی گەشتێکی خۆش بوو، بەڵکو پێویستە لەکاتی گەشتەکەدا چێژ وەرگریت.

**٢٢. بەرەو ڕووی ترسەکەت ڕابکە:** باشترین نهێنیپارێزی جیهانی ئەوەیە، لە لایەکەی تری ترسەوە، هەندێ شتی سەلامەتو گرنگ چاوەڕێی تۆ دەکات. کاتێك تۆ لەناو ترسەکانتدا کار دەکەیت، تۆ متمانەبەخۆبوونو توانای درووستکردنی ژیانی باشت زیاد دەکات. مردن دەمانکوژێت، بەڵام یەك جار، بەڵام ترس دەمانکوژێت، جار لەسەر جارو دووبارەش دەبێتەوە، هەر کاتەو بەشێوەیەك. سەرکەوتن بەسەر ترسدا زۆر وزەبەخشە. کاتێك تۆ لە لیستی پلانەکەتدا، قورسترین ئەرك ئەنجام دەدەیت، یان ئەوە دەکەیت کە تۆ لێی دەترسیتو ڕاستەوخۆ ئەنجامی دەدەیت. هەموو شتەکانی تر ئاسان دەبن.

**٢٣. چاوەڕێی شتی چاوەڕواننەکراو بە:** بۆ بوون بە داهێنەر، هیچ پەیوەندی بە ڕەسەنایەتییەوە نییە، هەمووی پەیوەندی بەوەوە هەیە، کە بتەوێت شتی چاوەڕواننەکراو بەدەست بهێنیت، واتە: هەموو کارێك بکەیت بۆ گەیشتن بە شتە چاوەڕواننەکراوەکان.

**٢٤. پەیوەندی درووست بکە:** "ئێمە هەریەکەمان فریشتەیەکی یەکباڵین، تەنها دەتوانین بفڕین بەرەو ڕووی یەکتر"، ناتوانین کەسێتیی خۆمان درووست بکەین بەبێ درووستکردنی پەیوەندیو بەردەوام بوون تێیدا. کاتێك کێشەیەکی کۆمەڵایەتیت دەبێتو دۆستانە چارەسەر دەکرێت، هەست بە هەستەکانت بکە، هەستەکانت بناسەوە، کەوایە چارەسەری کێشەکانت بکە بەشێوەیەکی داهێنەرانە لە مێشکتدا.

**٢٥. سەنگین بە:** زۆرجار هەست بە ئازاوەیەکی دەروونی دەکەین؛ لەبەرئەوەی بیر لە زۆر شت دەکەینەوە لە یەك کاتدا. تەرکیز بکەرە سەر ئەوەی کە دەتەوێت، دڵنیا بە بەدەستی دەهێنیت.

**٢٦. لە کرداردا، وەك پاڵەوان بە:** ئێمە پێویستمان بە پاڵەوانە، ئەوان کەسانی خاوەن هێزو توانان. ئەوان نیشانمان دەدەن کە مرۆڤ دەتوانێت زۆرێك لە ئەگەرەکان بەدەست بهێنێت، بەڵام تەنها ناسینی پاڵەوانو خۆشویستنیان بەس نییە. تەماشای لاشەی پاڵەوان مەکە، تەماشای هەستی ناوەکی ئەو بکە، وەکو ئەو کردار ئەنجام بدە.

**٢٧. ڕازیبوون بە خۆزگەی بەهێز:** یەکەم هەنگاو بۆ گەشەکردنی خۆزگەی بەهێز (بوونی ئامانجی بەهێز) ڕازی بوونە بە هەبوونی ئامانجەکە. دووەم ئەوەیە بزانیت کە دەتوانرێت گەشەی پێ بدرێت، وەکو ماسوولکە. سێیەم ئەوەیە کە ڕوون بێتو ڕاستگۆبیت سەبارەت بە خۆزگەو ئامانجە بەهێزەکەت؛ چونکە بەردەوام ئەو ئامانجە لە لای تۆیە.

**٢٨. بە خۆت بڵێ نەخێر:** زۆرێك لە خەڵکی دەترسن لە خود ڕێکخستن؛ چونکە لە بنەڕەتی وشەی ڕێکخستن (ڕێکوپێکی Discipline) وشەی شوێن کەوتوو (disciple) هەیە. کاتێك کە تۆ خود ڕێکخەر بوویت؛ ئەوا تۆ بەشێوەیەکی سادە بڕیاری ئەوەت داوە لە کاتی کێشەدا شوێنی بڕیاری خۆت بکەویتو باوەڕت بە خۆت هەبێت. کاتێك کە ئەم بڕیارەت دا؛ ئەوا ژیانی سەرکێشیت زۆر خۆش دەبێتو تۆ دەست دەکەیت بە بینینی خۆت کە کەسێکی بە توانایتو ڕێزو شکۆداری خۆت بەدەست دەهێنیت. کاتێك کەسێك دەیەوێت هەڵتبخەڵەتێنێت تۆ وریا دەبیتو دەڵێی نەخێر؛ چونکە تۆ باوەڕت بە بەدەستهێنانی ئامانجەکەت هەیە.

**٢٩. وشەی نوێ درووست بکە بۆ پەیوەندی:** ئەگەر خۆزگەو ئامانجە بەهێزەکانی خۆتت پەیوەست کرد بە شتە سلبییەکانەوە؛ ئەوا تۆ توانای داهێنەرانەی خۆت لاواز دەکەیت. بۆ زیادکردنی چارەسەر بیر لە وشەی نوێ بکەرەوە بۆ پەیوەندیکردن. یاریزانی کێش بەرزکەرەوە دەزانێت شکست بریتییە لە سەرکەوتن، واتا کاتێك کێشەکە بەرز دەکاتەوە بۆ خاڵێك کە ناتوانێت لەوە زیاتر بەرزی بکاتەوە، ئەوە ئەو خاڵەیە کە ماسوولکەکانی گەشەی پێویستی بۆ نەکردووە؛ تا بتوانێت زیاد بەرزی بکاتەوە. خۆت پرۆگرام بکە بە دووبارەکردنەوەی وشەی کەوتن بە شێوەیەکی ئیجابی؛ تا بتوانیت سوودی لێوەرگریت. بۆیە وریابە سەبارەت بەو وشانەی بەکاری دەهێنیت، هەروەها ڕێبەری زمانت بکە بەرەو کەسێتییەکی بەهێز.

**٣٠. پرۆگرامی خۆت بکە:** ئاگاداربە سەیری چی دەکەیتو گوێ لە چی دەگریت لە میدیاکاندا، پرۆگرامە ناباشەکانو بیری گاڵتەجاڕیو گوماناوی کە دەتوانن بێنە مێشکتەوە، بکەرە دەرەوە. کاتێك تۆ باش بوویت لە دیاریکردنی خاڵە نەرێنییەکانو هۆکارەکانیان؛ ئەوا هەواڵی خۆت درووست بکە. گوێ لە ئەوانی تر مەگرە؛ تا بزانیت چی ڕووی داوە. تۆ ببە بە ڕووداوەکە.

# هۆكاری سەركەوتن لە خوێندندا

هەژار سەعید

هە ندێك كەس دەژین، تەنها لەبەرئەوەی لە ژیاندان، نەك لەبەر هۆكارێك، یا گەیشتن بە هیواو ئامانجێك، نرخی ژیان لەخۆیدا نییە، بەڵكو لەو شتەدایە كە لە پێناویدا دەژیت. كەسە سەركەوتووەكان ئەوانەن كە هۆكارێك دەگرنەبەر؛ تا لە پێناویدا بژین، یا ئامانجێك كە دەیانەوێت بەدەستی بهێنن. پێویستە مرۆڤ هەمیشە ئامادە بێت بۆ پێدانی نرخی هەر شتێك كە بیەوێت بەدەستی بهێنێت، ناكرێت تەنها نانێك بەدەست بهێنرێت، بەبێئەوەی نرخەكەی بدرێت، بەهەمان شێوە ناكرێت سەركەوتوو بین لە هەر بوارێكی ژیانماندا، تا ئامادە نەبین نرخی ئەو شتە بدەین. بەدڵنیاییەوە نرخی سەركەوتن پارە نییە، بەڵكو كۆمەڵێك كاری دیاریكراوە، كە لە توانای هەموو مرۆڤێكدا هەیە ئەنجامی بدات؛ تا سەركەوتوو بێت. لە خوێندنیشدا بەهەمان شێوە وەك كایەكانی تری ژیان، كۆمەڵێك یاساو ڕێسا هەیە، دەبێت ڕەچاویان بكەین تا سەركەوتوو بین، هەرچەند بەتواناو لێهاتووش بین. زۆرێك لە خوێندكاران دەخوێنن، بەڵام نازانن چۆن؟ كەی؟ بۆچی دەخوێنن؟، بەبێ زانینی هۆكارەكانی سەركەوتن، كاتێكی زۆرو بەشێكی زۆری هەوڵو ماندووبوونەكان بەفیرۆ دەچن. هەندێجار دەبیستین كە دەگوترێت هەوڵێكی زۆرمان داوەو كاتێكی زۆر خەریكی خوێندنەوەو پێداچوونەوە بووین، بەڵام لە تاقیكردنەوەكاندا سەركەوتوو نەبووین، لە كاتێكدا كەسانێك هەن، كە كەمتر هەوڵیان داوە، بەڵام سەركەوتوو بوون. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هەندێك هۆكار، كە خوێندكاری سەركەوتوو پشتی پێ بەستووە، ئەویش چەند خاڵێكە:

١. **ئارەزووبوون لە خوێندن:** هەندێك خوێندكار ویستو ئارەزووی تەواویان بۆ خوێندن هەیەو هەوڵی بەردەوام دەدەن بۆ گەیشتن بەسەركەوتنو بەدەستهێنانی نمرەی بەرزو بەجێهێنانی هەموو ئەو ئەركانەی لێیان داوا دەكرێت.

٢. **ڕێكخستنی كات:** ڕێكخستنی كات بەشێوەیەكی درووستو گونجاو یارمەتیی تەواو دەدات، لە سەركەوتنی خوێندكارو دانانی كاتی گونجاو بۆ كارەكانی تری ژیانی. بۆ ڕێكخستنی كاتەكانمان، دەبێت ڕەچاوی ئەم خاڵانە بكەین (كاتی خەوتنو هەستانەوە، كاتی ڕۆیشتن بۆ خوێندنگەو مانەوە تێیدا، كاتی كارەكانی ماڵەوە، كاتی خواردنو خواردنەوە، كاتی قسەكردن لەگەڵ ئەندامانی خێزاندا)، پاش ئەوە دەتوانرێت بزانرێت كە چۆن كاتەكانمان دابەش بكرێت، بە شێوەیەك كە مافی هیچ كامێكیان نەدرێت بە یەكێكی تریانو لە كایەكانی تری ژیاندا، بەهەمان شێوە سەركەوتوو بین؛ چونكە سەركەوتن تەنها یەك بوار ناگرێتەوە.

٣. **هەڵبژاردنی شوێنی گونجاو بۆ خوێندنو پێداچوونەوە:** خوێندكاری سەركەوتوو، چەندە لە لای گرنگە كە بخوێنێت، هێندەش گرنگی بەو شوێنە دەدات، كە تێیدا دەخوێنێتو پێداچوونەوە بۆ ئەو بابەتانە بكات، كە پێشتر خوێندوویەتی؛ چونكە ئەو شوێنەی كە دیاری دەكرێت بۆ خوێندنەوە، كاریگەریی ڕاستەوخۆ لە سەر مێشكی مرۆڤ دادەنێت.

٤. **خۆئامادەكردن بۆ بابەتەكە:** هۆی سەرەكیی سەركەوتنو تێگەشتنی تەواو لەو بابەتانەی كە مامۆستا باسی دەكات، ئەوەیە كە خوێندكار، پێش ڕۆشتنی بۆ خوێندنگە، ئەو بابەتەی



جارێك، یا دووجاری خوێندبێتەوەو ئامادەکاری بۆ کردبێت، هەر پرسیارێك، یا شتێکی لەسەر بابەتەکە بۆ درووست ببێت، لای خۆی بە تێبینی بینووسیت..

٥. توانای بێدەنگبوونو گوێگرتن: یەکەم ڕێگە بۆ بەدەستهێنانی هەر زانستو زانیارییەك بێدەنگبوونە، پاشان گوێگرتن بە وردی لەو بابەتەی باس دەکرێت، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی بتوانرێت جیاوازی لە نێوان گرنگو گرنگتردا بکرێتو باشتر بابەتەکە بە بیرماندا بێتەوە لە کاتی پێداچوونەوەدا. "مرۆڤی سەرکەوتووش، زۆر گوێ ڕادەگرێتو کەم دەدوێت".

٦. نووسینەوەی تێبینییە گرنگەکان: لە ئەنجامی گوێگرتنی تەواو بۆ ئەو بابەتەی باس دەکرێت، دەتوانرێ ئەو تێبینییانە بنووسرێتەوە، کە مامۆستا باسی دەکاتو گرنگی زیاتری پێ دەدات، کە ئەمەش بۆ تاقیکردنەوە سوودێکی زۆر بە خوێندکار دەگەیەنێت.

٧. شارەزابوون لە خوێندنەوەدا: لە کاتی خوێندنەوەدا پێویستە ڕەچاوی هەندێك خاڵی گرنگ بکرێت؛ تا ئەو بابەتەی دەخوێنرێتەوە، باشتر سوودی لێ وەربگیرێت، لەوانە: (خوێندنەوەی بابەتەکە بەخێرایی بە بێئەوەی ئامانجی سەرەکی بابەتەکە لەبیر بکرێت، ئەمەش کاتێکی زۆرمان بۆ دەگێڕێتەوە، ئامانجی چییەو مەبەست لە باسکردنی ئەم بابەتە چییە؟ چی چارەسەر کردووە؟ چۆن چارەسەری کردووە؟) ڕەچاوکردنی ئەم خاڵانە، وا دەکات سوودێکی زۆرتر ببینین لە خوێندنەوەی ئەو بابەتەی کە دەیخوێنینەوەو ئەو زانیارییانەشی کە فێریان دەبین تێکەڵی نەکەین.

٨. شارەزابوون لە جوان نووسیندا: واتە: نووسینی ئەو زانیارییانەی کە دەنووسرێن بەجوانیو بەڕوونی، بە شێوەیەك کە بەئاسانی بتوانرێت بخوێنرێنەوەو تێگەیشتن لێیان ئاسان بێت، بەجۆرێك کە نەبێتە هۆی تێکەڵکردنی زانیارییەکان بەسەر یەکداو قسەکردن تەنها لەسەر ئەو پرسیارەی ئاراستەت دەکرێت..

٩. ئاگاداربوون لە جووڵەی مامۆستا: پێویستە خوێندکار بە وردی ئاگاداری هەڵسوکەوتی مامۆستاکەی بێت؛ تا بتوانێت لەو ڕێگەیەوە هەندێك زانیاری بەدەست بهێنێت، بۆ نموونە سوودوەرگرتن لەو جووڵەو ئاماژانەی کە مامۆستا دەیانکات وەك بەرزکردنەوەو نزمکردنەوەی دەنگی، دانیشتنێ هەستێتە سەرپێ، یا بە دەست هەر ئاماژەیەکی تر بکات، ئەمانە ئەوەمان پێدەڵێن کە ئەو بابەتە بە لای مامۆستاوە چەند گرنگە.

١٠. سوودوەرگرتن لە ئەزموونی ڕابوردوو: پێویستە خوێندکار گرنگی تەواو بەو تاقیکردنەوانە بدات، کە لە ڕابوردوودا ئەنجام دراون، تا بتوانێت ئاستی خۆی هەڵبسەنگێنێتو لەو ڕێگەیەوەو شارەزای شێوازی تاقیکردنەوەی ئەو بابەتە ببێت. ئەمەش وا دەکات ترسی کەم ببێتەوە..

لەبیرت بێت کە: سەرکەوتن کۆتایی نییەو دۆڕانیش هەمیشەیی نییە.



# وەك دەریای مردوو مەبە

زەینەب سەعید

دەریای مردوو قووڵترین جێگایە لە جیهاندا، لەلایەن سەرجەم ئەو شارستانێتییانەی لە دەوروبەری ئەو دەریایە ژیاون، وەها باس کراوە کە خوێیەکی زۆری تێدایە، کە دەگاتە دە هێندەی خوێی دەریاکانی دیکە، هیچ گیانەوەرێکی زیندووشی تێدا نییە، جا وا لەخۆت مەکە ببیت بە دەریای مردوو، خۆت لە ڕیزی مردووواندا دابنێیت.

وەك ئەو مەبە، چونکە کەشتی پێکەوەژیانو هاوڕێیەتی مەلەت تێدا ناکاتو لە کەنارەکانتدا کەشتی خۆشەویستی لەنگەر ناگرن.

بە ڕووی خۆتدا دامەخرێو دواتر دەوروبەرت وازت لێ بهێنن، ئیدی پەتی پەیوەندیو گەیاندنەکانی دەوروبەرت دەپچڕێتو یەك بە یەك خۆشەویستانت لە دەست دەدەیت. با نامۆیی لە هەڵسوکەوتتدا نەبێتو بەو هۆیەوە دەوروبەرت بڵاوەی لێ بکەن، هەمیشە خۆت بڵند بکە بەرەو باڵاو پلەبەرزی، هەرگیز کەم ئاستو لەخوار ئاستی دڵخوازیو هیوابەرزی خۆت مەبە، بە توندوتیژی مامەڵە مەکە؛ چونکە کەسانی دەوروبەرت لێت بێزار دەبنو لە بینینت هەڵدێن، بە دەربڕینێکی تفتوتاڵ مەدوێ، وەك تفتوتاڵی خوێیەکەی، کە بووە بەهۆی ئەوەی گەنجینەکەنی دەریا وەك گەوهەرو مرواریو مەرجان تێیدا نەبن.. لەبەر ئەوە بەدوای ئەو گەنجینانەتدا بگەڕێ، کە دەتکەن بە کەسێکی تاکو بێوێنەو بە ئاکارە قەشەنگو باڵاکان دەترازێننەوە.

# نامۆبوون!

ئارامی نەخشین

ئـــەو بـــێ ئومێدییەی  بەرۆکی هەمووانـــی گرتووە، خەریکە ونم دەکات لەخۆیدا، خەریکە وام لێ دەکات دەست هەڵبڕمو بڵێم دۆڕام، ئیتـــر جەنگی ژیان بە من ناکرێت! ئێمە مرۆڤین مرۆڤ! بەرگەی ئـــەو هەموو توندیو زبرییە ناگرین، زۆر ناسکترین لەوەی کە پێمان دەکرێت، درووستکراوێکین وشـــە دەمانکوژێت، چجای بگات بە تۆپو تەیارەو ئەتۆم!

خۆزگە دەکرا بچمە شـــوێنێك، چـــاوی مرۆڤەکانم لێوە دیار نەبێـــت، دەنگیـــان نەبیســـتمو هەواڵیانـــم پێ نەگات، بەدەســـت مرۆڤەوە چیمان لێ بەســـەر هاتووە، بەدەســـت هاوڕەگەزەکانمان چۆن ژیانمان لێ بووەتە دۆزەخ!

ببینـــن چۆن تەفرەیـــان داینو دەســـتخەڕۆیان کردین، چۆن کراویـــن بـــە دوژمنـــی یەکدی، چۆن لـــە هەوڵ داین؛ تا شـــکۆی یەکدی بشـــکێنین، خۆ ئێمە بۆ ئەوە درووســـت نەکراوین، چەك هەڵبگرینو بکەوینە وێزەی یەکدی، بۆ ئەوە نەهاتووین؛ تا گرەو لەســـەر کوشـــتنو خوێنڕشـــتنی یەکدی بکەین، سرووشتمان بە هەموو ئەمانە نامۆیە!

نازانـــم بۆچـــی بەبێ هۆ، حەزمان بە چـــارەی یەکدی نییەو چاومان بە یەکدی هەڵنایەت، بەقەد کێوێك لە هەناوماندا ڕقمان کۆکردووەتەوە بەرامبەر بەیەك، ئەرێ دراوســـێ گیان، بۆ کەیفت پێـــم نایەت، بۆچ ڕووم لێ وەردەگێڕیـــت، بۆچی وا بە مۆنییەوە لێم دەڕوانیت، پێم بێژە: چ تاوانێکم کردووە؟!

ئـــەرێ ئێـــوەش ئەو هەســـتەتان هەیە وەك مـــن؟ ئەی ئەوە نابینن لە سەرەی نان بەگرژو مۆنییەوە تەماشای یەکدی دەکەین، لە شۆفێریدا هەڵدەکوتینە سەر یەکدی، لە بازاڕدا بە وشەی زبر مامەڵـــە دەکەیـــن.. لە تەنگانەدا،  کەس لات لـــێ ناکاتەوە، بەڵکو گاڵتەشـــت پێدەکەن، لە پەیوەندیی خزمایەتی هەر مەپرسە، لە پێشملەدا جۆرێکینو لە پاشەملەدا جۆرێکی دی، تا بۆمان بکرێت ملی یەکدی دەشکێنینو پشتی یەکدی دەدەین بە زەویدا!

نـــا، نامەوێت پێـــم بڵێن هەڵەیت! ئەگەر ڕاســـت نیم، بۆچی ماڵەکانو ســـەیارەکانو پشتێنەکان، پڕیەتی لە چەك، چۆن دڵنیا بم بەسەر مندا تاقی ناکرێتەوە!

ئێســـتا مرۆڤەکان، هەموو شـــتێکیان هەیـــە، خاوەنی هەموو ماددەیەکن، لە هیچیان کەم نییە، بەڵام لەســـەر حیسابی ڕەوشت! ئەوەی تێیدا هەژارن، ڕەوشتە.. ئەوەی تێیدا دۆڕاون، پەروەردەیە!

هەمووان زۆر بەجدییەوە باســـی قەیرانـــی داراییو قەیرانی ئاوو قەیرانی چیو چیمان بۆ دەکەن، کەسێك هەڵەیەکی نەکرد، بێتو باســـی تەنگەشـــەو قەیرانـــی ئەخلاقی بکات، لـــە کاتێکدا مرۆڤایەتی لە گەورەترین قەیرانی ئەخلاقیدایە!

لە ڕاســـتیدا سەرچاوەی درووســـتبوونی هەموو ئەو قەیرانو نەهامەتییانە؛ غیابی ڕەوشـــتە، مرۆڤ ئەگەر ڕەوشتی بوو، زاتی ئەوە ناکات، بە ئاسانی مرۆڤ هەڵبوەرێنێت، ڕێگە بە خۆی نادات ببێت بە مایەی ئەزیەتو ئازار بۆ مرۆڤەکان!

بۆیە لە نێو ئەو حەشـــاماتەدا، نامۆن کەســـانێك بێنو باسی ڕەوشـــت بکەن، نامۆن کەســـانێك وانەی ڕەوشـــت بڵێنەوە، نامۆن ئەوانەی دڵیان قوڵپ دەدات بۆ حاڵی مرۆڤایەتی، ئەوانەی لە نێو قەیرانی ڕەوشـــتدا، ڕەوشـــتی جوان پەخش دەکەنو بانگەشە بۆ سادەییو دڵنەرمیو مەحەببەتو بەخشینو بەزەییو یارمەتیدان دەکەن!

بەڵـــێ، نامۆیە کەســـێك دارایی ئەو ڕەوشـــتی بێـــت، نامۆیە مرۆڤێك پابەندی بەهاو بنەما ڕەوشتییەکان بێت، نامۆیە کەسێك وشـــەی زبرو جنێو بەسەر زمانیدا گوزەر نەکات، نامۆیە کەسێك ڕێز لە گەورە بگرێتو بەزەیی بەبچووکدا بێتەوە، نامۆیە ئەوەی سینەســـافو دەروونپـــاك بێت، نامۆیە ئـــەوەی دەنگ هەڵنابڕێت بەســـەر ئەوانی دیـــدا، نامۆیە ئەوەی لەبری بۆنی ســـیرو پیازو گـــۆرەوی، بۆنـــی گوڵاو پەخش بـــکات! نامۆیە ئـــەوەی ئارامگرو لەسەرخۆیە! ئەمەش ئەوپەڕی نامۆبوونە!!



بەرزان ئەبوبەکر



# هارلاند ساندەرز (١٨٩٠ - ١٩٨٠)

**عەقڵ وەك پەڕەشووت وایە، تا نەکرێتەوە کار ناکات! لۆرد تۆماس**

**ئاوات‌و هیوابەرزی، ماندووبوون ناناسێت..**

هارلانـــد ســـاندەرز ئەو ناوەی کە ڕەنگە زۆر ناســـراو نەبێت، بەڵام ئەگەر بتەوێت، ســـەیری وێنەکەی بکەیت، تەنها یەکێك لە تابلۆکانی چێشتخانەکانی کنتاکی دەبینیت.

ئـــەم پیاوە، چۆن توانی لە تەمەنی شەســـتو پێنج ســـاڵیدا، یەکێـــك لـــە بەناوبانگترین زنجیـــرە چێشـــتخانەکانی جیهـــان دابمەزرێنێت، بە زۆربەی دەوڵەتانی جیهاندا بڵاو بێتەوە؟

ئـــەم پیـــاوە بێکارە، چـــۆن توانـــی کار بۆ زیاتر لـــە ٧٥٠٠٠٠ هـــەزار کـــەس بدۆزێتەوە، کە ئـــەو ژمارەیە، ژمـــارەی کرێکارانی چێشتخانەکانی کنتاکییە لە سەرانسەری جیهاندا.

بـــۆ وەڵامدانـــەوەی ئەم پرســـیارانە، تـــا کۆتایـــی، بابەتەکە بخوێنەرەوە:

هارلاند ســـاندەرز لە بەرواری ٩ی ئەیلولی ساڵی ١٨٩٠ لەدایك بووە، تەمەنی تەنها شـــەش ساڵان بوو، باوکی کۆچیی دوایی کرد، دایکی ناچار بوو، بەرپرســـیارێتیی بەخێوکردن‌و پەروەردەکردنی منداڵەکانـــی بگرێتـــە ئەســـتۆ، بـــارودۆخ ناچاری کـــرد، دوو برا بچووکەکەی فێری هونەری چێشـــتلێنان بکات، لە تەمەنی حەوت ســـاڵاندا، چێشـــتلێنەرێکی بەتوانا بوو، تەمەنی گەیشتە ١٠ ساڵان، لـــە کێڵگەدا تەنها بـــە دوو دۆلار، بۆ هەر مانگێـــك کاری دەکرد، هەروەها لەنێو تیمێکی ئاگرکوژێنەوە هێڵی ئاســـنین کاری دەکرد، هاوکات لەو ماوەیەدا بە شێوەی باس ناردن «المراسلة» دەیخوێند.

لـــەو کاتـــەدا داهاتەکەی بۆ هەر کاتژمێرێك، ١٦ ســـەنت بوو، کاری بەتاڵکردنی ئۆتۆمبێلی خەڵـــوز بوو، تواناکانی بەردەوام لە هەڵکشـــاندا بوو، شانبەشـــانی کارکردن، توانی بڕوانامە لە بواری یاســـادا وەربگرێت، لەبەرئەوە ســـەرقاڵی یاســـا بوو، لە دادگاکانی (لیتل ئەرکنســـاس)، بەڵام نەیدەتوانی لەو ڕێگەیەوە، داهاتێك بۆ خۆی مســـۆگەر بـــکات، لەبەرئەوە ئەو بڕوانامەیـــەی لەو بوارەدا بەدەستی هێنابوو، بەلای ساندەرزەوە، نرخێکی ئەوتۆی نەبوو!

لەبەرئـــەوە ســـاندەرز، وازی لـــە کاری پارێـــزەری هێنـــا، وێستگەیەکی کردەوە بۆ خزمەتگوزاریی ئۆتۆمبێل، لە ساڵی ١٩٢٩ لە ویلایەتی کنتاکی، ڕۆژێك یەکێك لە کڕیارەکان پێی دەڵێت: لەم ناوەدا چێشتخانەیەکی باش بەدی ناکرێت؛ تا مرۆڤ بڕوات نانی لێ بخوات.. ساندەرز هاوڕا بوو، لەگەڵ بۆچوونەکەی.

ئیدی لەو کاتەوە، بیرۆکەی درووســـتکردنی چێشـــتخانەیەك لە مێشـــکیدا خولی دەخوارد، کەس لـــەو بڕوایەدا نەبوو، توانجی کڕیارێکـــی گـــەڕۆك، ببێتـــە هـــۆی داگیرســـانی ســـەرۆکێك، بۆ لەدایکبوونـــی زنجیرەیەك چێشـــتخانە، کە شۆڕشـــێکی لە بواری درووستکردنی خواردنی خێرادا بەرپا کرد.

ســـاندەرز لەوبارەیەوە دەڵێت: باشـــترین کارێك کە ئەنجامم دابێـــت، لە ماوەی ژیانمدا، بیرۆکەی درووســـتکردنی چێشـــتخانە بـــوو، هەروەها ئەگەر دەســـتم بە فرۆشـــتنی خـــواردن بکردایە، بەدڵنیاییـــەوە ئـــەو خواردنانەی کە درووســـتم دەکـــرد، خراپتر نەدەبوو لە خواردنی خاوەنی چێشتخانەکانی دیکەی شار.

ســـەرەتای دەستپێکردنی ساندەرز، بە درووستکردنی خواردن، لە ژوورێکی بچووکەوە بوو، لە پشـــت وێســـتگەی خزمەتگوزاریی ئۆتۆمبێلەکەیەوە، پاشـــان گۆڕی بە چێشـــتخانەیەکی بچووك، کە مریشکی برژاوو ســـەوزەی تازەی تێدا دەفرۆشت، ئەو چێشتخانە بچووکـــە، ناوبانگێکی گـــەورەی دەرکرد، تا ناچاربوو وێســـتگەکە دابخات‌و بیگۆڕێت بە چێشتخانەیەك بە ناوی (کافی ساندەرز).

ســـاڵی ١٩٣٠، ساندەرز چێشـــتخانەکەی بەتەواوی فراوان کرد، بەشـــێوەیەك کە جێگـــەی ١٤٢ کەس دەبوویەوە، ئیـــدی بەردەوام چاوی لەســـەر فراوانکردنـــی‌و پەرەپێدانـــی‌و فێربوونی بەردەوام بوو، بەشداری هونەری بەڕێوەبردنی چێشتخانە‌و هۆتێلی کرد بۆ

ماوەی هەشت هەفتە، لە زانکۆی کۆرنێل.

ساندەرز شەیدای مریشکی برژاو بوو، بەڵام نەك بە ڕێگەی کلاسیکی بە زەیت، کە هیچ تام‌وچێژێکی پێ نابەخشێت، لەبەرئەوە بەردەوام لە گەڕاندا بوو، بەدوای ڕێگەیەکی نموونەییدا بۆ برژاندنی مریشك، تا ساڵی ١٩٣٩ توانی ڕێگەیەکی نموونەیی بدۆزێتەوە، بۆ برژاندنی مریشك، ئەوەی یارمەتی دا بۆ دۆزینەوەی ئەم داهێنانە نوێیە، دۆزینەوەی مەنجەڵی هەڵمین «بوخار» بوو، کە لە ماوەی کەمتر لە ١٠ خولەکدا، بە هەڵم، مریشکێکی بەلەزەت‌و پێگەیشتووی ئامادە دەکرد، بێئەوەی تام‌و بۆنی خۆی لەدەست دابێت، بەبێ بەکارهێنانی ڕۆن، هەموو ساڵێك ساندەرز تاقیکردنەوەی نوێی ئەنجام دەدا، بۆ گەیشتن بە تێکەڵەیەکی گیایی‌و بەهارات.

لە ساڵی ١٩٤٩، ساندەرز پلەی کۆلۆنێلی پێ بەخشرا، بۆ ئەو دەستکەوتانەی لە ویلایەتی کنتاکی بەدەستی هێنا، بەڵام ساندەرز حەزی دەکرد، ببێتە پیاوی خاوەنکار.

لە ساڵی ١٩٥٣، زیاتر ١٦٤٠٠٠ سەدو شەستو چوار هەزار دۆلاریان پێ دا؛ بۆئەوەی چێشتخانەکەی لێ بکڕن، هەرچەندە بڕی پارەکە زۆر زۆر بوو، مرۆڤی بوغرا دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ساندەرز ڕەتی کردەوەو چێشتخانەکەی بفرۆشێت، دوای چەند ساڵێك نەخشەی ڕێگاوبان گۆڕا، ڕێگەکە لە چێشتخانەکەی ساندەرزەوە دوور کەوتەوە، بەوەش شوێنی چێشتخانەکە، وەکوو جاران شوێنێکی شیاوو باش نەما، لەبەرئەوە ناچاربوو کە چێشتخانەکەی بفرۆشێت، ئەوەبوو لە زیادکردنێکی ئاشکرادا، فرۆشتی بە ٧٥٠٠٠ حەفتاو پێنج هەزار دۆلار. کە ئەو بڕە بەشی دانەوەی قەرزەکانیشی نەدەکرد.

دواجار کۆلۆنێل بڕیاری دا خانەنشین بێت، بڕی ١٠٥ دۆلار وەکوو دەستەبەری کۆمەڵایەتی بۆ خۆی‌و خێزانەکەی ببڕێتەوە.

هەرچەندە لە ڕووی دەروونییەوە تێك شکابوو، بەڵام خۆی بە دەستەوە نەدا، بە خۆی دەگوت: لەبەردەمتدا جگە لە یەك کار، شتێکی دیکە نییە، کە دەتوانیت ئەنجامی بدەیت، ئەویش برژاندنی مریشکە، ئەمەش ئەو کارەبوو کە بەدرێژایی ژیانی ئەنجامی دەدا.

ساندەرز شێوەی ئامادەکردنی مریشکی برژاوی فرۆشت بە چێشتخانەیەك لە ویلایەتی ئۆتا، هەروەها وای بەباش زانی لەسەر ئەم بیرۆکەیەی بەردەوام بێت، ئەوەش بووە هاندەرێك کە گرێبەستی دیکە لەگەڵ چێشتخانەکانی دیکە ئەنجام بدات.. بە بڕی ٤ سەنت بۆ هەر مریشکێکی فرۆشراو.

ساندەرز دابەزییە نێو بازاڕی کارەوە، بۆ بڕەودان بە بیرۆکەکەی، سەرەڕای ئەوەی تەمەنی چووبووە سەرو دوچاری نەخۆشیی جومگەکان بووبوو.

ساندەرز زۆر جار لە نێو ئۆتۆمبێلەکەیدا دەخەوت؛ بۆئەوەی کرێی ئۆتێلەکەی بۆ بگەڕێتەوە، لەنێو وێستگەکانی ڕێگەدا، خۆی ڕێکوپێك دەکردو سەیری ئاوێنەی دەکردو بە خۆی دەگوت: هارلاند، پێویستە سەر بکەویت!

لە ماوەی دوو ساڵ گەڕان‌و هەوڵدان، تەنها توانی قەناعەت بە پێنج چێشتخانە بکات، کە بیرۆکەکەی پەسەند بکەن، لەبەرئەوە هەموو جارێك بە خۆی دەگوت: زۆر سەختە قەناعەت بە خاوەن چێشتخانەیەك بکەیت، کە مریشکەکەی لە ئاستی پێویستدا نییە.

ساندەرز بەردەوام بوو لە گەڕان‌و هەوڵدان، تا ئەو کاتەی تەمەنی گەیشتە ٧٠ ساڵی، ژمارەی چێشتخانەکانی گەیشتە ٢٠٠ چێشتخانە لە ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکاو کەنەدا.

دوای ئەم ژمارەیە ساندەرز دەستی لە گەڕان هەڵگرت، لەبەرئەوە پێی باش بوو، کە ئیدی دابنیشێت، هەروەها خۆی تەرخان بکات بۆ هاوکاریی خێزانەکەی، لە ئامادەکردنی تێکەڵەیەکی گیایی‌و بەهارات. هەروەها لە ڕێگەی پۆستەوە بیفرۆشن، بەشێوەیەك کە تا ئێستاش کەمێك نەبێت، کە ژمارەیان لە پەنجەی دەست تێناپەڕێت نایناسن.

ساندەرز لەوبارەیەوە دەڵێت: ڕۆژانێکی سەخت بوو، من گژوگیاو بەهاراتم تێکەڵ دەکرد، وەکو تێکەڵاوکردنی لەو چیمەنتۆ بۆ خانوو، هاوسەرەکەم یارمەتیدەری دەستە ڕاستم بوو، ئەو قووتووی درووست دەکردو سەرپەرشتی گەنجینەی دەکردو داواکارییەکانی دەگەیاند.

ساڵی ١٩٦٣ ژمارەی چێشتخانەکانی گەیشتە ٦٠٠ چێشتخانە، بەشێوەیەك پڕ بووبوو، کە بەرگەی نەدەگرت، لەبەرئەوە بڕیاری دا، خاوەندارێتیی چێشتخانەکانی کنتاکی بفرۆشێت بە جون براون جونیور و جاکماکسی سەرمایەدار، بە بڕی یەك ملیۆن دۆلارو مووچەی مانگانەش ٤٠ هەزار دۆلار بۆ درێژایی ژیانی، ئەو مووچەیەش بەپێی داهات لە زیادبووندا بێت، تا دەگاتە ٧٥ هەزار دۆلار، لەبەرامبەر ڕاوێژو ڕیکلام‌و کورسییەك لە ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکە.

کۆلۆنێل ساندەرز لە ساڵی ١٩٨٠ کۆچی دوایی کردو لە لویزفیڵ بە خاك سپێردرا.

ساڵی ١٩٨٢ چێشتخانەکانی کنتاکی بوون بە بەشێك لە کۆمپانیای ڕینۆڵدز.

لە ساڵی ١٩٨٦ بووە بەشێك لە کۆمپانیای بیبسی کۆلا، بەرامبەر ٨٤٠ ملیۆن دۆلار.

لە ساڵی ١٩٩٥ ژمارەی چێشتخانەکان گەیشتە ٩٠٠٠ چێشتخانە.

ژمارەی کارمەندەکانی لە ساڵی ٢٠٠٥ گەیشتە ٧٥٠٠٠٠ حەوت سەدو پەنجا هەزار کارمەند لە ٩٢ دەوڵەتی جیهاندا.

کۆلۆنێل ساندەرز، نموونەیەکە پێویستە چاوی لێ بکرێت، لە ئارامگرتن‌و لێبڕان‌و سووربوون‌و کۆڵنەدان، وێڕای ئەوەی کەسێکی بە تەمەن‌و ناساغیش بوو لە ڕووی تەندرووستییەوە، ئەو هەموو کات تێ دەکۆشاو هەوڵی دەدا، لە پێناوی ئەو بیرۆکەیەی باوەڕی پێی بوو.

دواجار توانی لە قاوەخانەیەکی بچووکەوە ببێتە خاوەنی ٩٠٠٠ چێشتخانە لە سەرانسەری جیهاندا.

# گەر ناتوانین ... خۆ دەتوانین!

هاودین زانا

گەر ناتوانین دۆست بین.. خۆ دەتوانین دوژمن نەبین!
گەر ناتوانین ڕاستگۆ بین.. خۆ دەتوانین درۆ نەکەین!
گەر ناتوانین زانا بین.. خۆ دەتوانین نەزان نەبین!
گەر ناتوانین ئارامگر بین.. خۆ دەتوانین تووڕە نەبین!
گەر ناتوانین حەق بڵێین.. خۆ دەتوانین دژی نەبین!
گەر ناتوانین ببەخشین.. خۆ دەتوانین کینە هەڵگر نەبین!
گەر ناتوانین زەردەخەنە بکەین.. خۆ دەتوانین گرژ نەبین!
گەر ناتوانین چارەسەر بین.. خۆ دەتوانین گرفت نەبین.
گەر ناتوانین جوانی یەکتر ببینین.. خۆ دەتوانین نەنگی یەکتر داپۆشین!
گەر ناتوانین دادگەر بین.. خۆ دەتوانین زاڵم نەبین!
گەر ناتوانین گەورە بژین.. خۆ دەتوانین بودەڵە نەژین!
گەر ناتوانین سەرکەوتوو بین.. خۆ دەتوانین شکستخواردوو نەبین!
گەر ناتوانین مامۆستا بین.. خۆ دەتوانین فێرخواز بین!
گەر ناتوانین چاك بین.. خۆ دەتوانین خراپ نەبین!
گەر ناتوانین چرا هەڵکەین.. خۆ دەتوانین فوو لە چرا نەکەین!
گەر ناتوانین بونیادنەر بین.. خۆ دەتوانین ڕووخێنەر نەبین!
گەر ناتوانین خەمی یەکتر لا ببەین.. خۆ دەتوانین خەم بۆ یەکتر زیاد نەکەین!



چ ڕەحمەتێکە ئێمە تێیدا نووقم بووین؛ چ بێئاگاییەکیش لەو ڕەحمەتە دەوری ئێمەی داوە! مرۆڤ هەمیشە تووشی لەبیرچوونەوە دەبێت، کاتێك بۆ ماوەیەك لەناو ئاسوودەییدا دەبێت، تەنانەت لە بیریشی نییە، کە لەناو ئاسوودەییو ئارامیدا ڕێ دەکات! ئەو کاتانەی لە بەلا بەدوورین، بیر دەکەینەوە ئێمە چەند بێبەختین، کە فلان ڕۆژ چیمان بەسەر هاتو فلان هاوڕێ چۆن تووشی نیگەرانی کردین، یان بیر دەکەینەوە لە بەڕێکردنی ئەو دەمەی کە یەکێك لە نزیکەکانمان بە دەردێکەوە دەینالاندو ئێمەش لە دەوری بووین... بەم جۆرە کاتە ئارامەکان بێ چێژ وەرگرتن بە هەدەر دەدەین، تەنانەت لەبیری دەکەین سوپاسگوزاربین بە تێپەڕینی ئەو ناهەمووارییانە! مرۆڤ زۆر زوو کاریگەر دەبێت بە ڕووداوەکانی دەورووبەر؛ مرۆڤی ئاسایی پێی خەفەتبار دەبێتو مرۆڤی ژیر لێوەی فێر دەبێت.

چ دڵێك دەتوانێت هەمیشە تەنگ بێت، هەمیشە ئارام بێت، یاخود هەمیشە لە چاوەڕوانیدا بێت؟ خودا خۆی خاوەنو خوڵقێنەری مرۆڤەکانە، بۆیە هەمیشە تیشکێك لە ڕەحمەتی خۆی بە بەندەکانی دەبەخشێتو دەیانخاتە ناو دۆخێکەوە؛ خۆشی، ئارامی، ئازار، جێهێشتن، یان هەر چییەك کە باشی تێدایە بۆ ئێمەو جەستەو بیرمان پێویستییە. وەك ئەو گیاندارەی کە بێچووەکەی لەدایك دەبێو پاش کەمێك هانی ڕۆیشتنی دەدات بەو جەستە لاوازەوە کە بێچووەکە ناتوانێت خۆی لەسەر ڕابگرێت! ئەگەر کەسێك ناشارەزا بێت، وا هەست دەکات، ئەمە بێڕەحمییە! لە کاتێکدا گەورەترین خەڵاتی دایکەکەیە بۆ بێچووەکەی. بەهەمان جۆر ڕەحمەتی خودا بۆ مرۆڤەکان، جگە خودا کەم کەس هەست بە حیکمەتی دەکەن. کاتێك کە دڵخۆشییەکانت لا ئاسایی دەبێتەوەو وەختە تامو چێژیان لەلات کەم ببنەوە، خەریکیت بۆ بەرزتر دەڕوانیتو لات وایە بەدەستهێنانی زیاترو سامانی زۆرتر دڵخۆشی دەهێنێت، ئیتر کاتی ناردنی ئەو ڕەحمەتەیە لەلایەن ئەوەوە بۆت؛ بۆئەوەی بە ئاگات بهێنێتەوە تۆ چەندە بەختەوەریت. لەشساغیت بیر دەچێتەوە لەوەی لەمێژە تووشی ئازار نەبوویتو بیرت کردووەو لە بەرامبەر پێچەوانەی نەخۆشییەکەشت بیرچووەتەوە کە هەمان ئازارە؛ چونکە تۆی مرۆڤ لە خۆبایی دەبیت. بەڵام خودا لەم بەڵایەش بە دوورت دەگرێتو تووشی ئازارێکت دەکات کە لە توانای تۆدا هەبێت، تا بە بیرت بێتەوە نیعمەتی لەشساغیت پێ درابوو، وەخت بوو لە بیری بکەیت! یان لە هەوڵەکانتدا تووشی شکستت دەکات، بۆ ئەوەنا کە بێهیواییو بێئومێدی ڕووت تێ بکات، بەڵکو تا بەهێزتر بیتو پێت بڵێت کە سەرکەوتن چەندە بەنرخو گرانەو دەستخستنی ماندووبوونی دەوێت... گرنگە هەموان بزانین ئەوەی هەیەو نییە، تیشکێکن لەو ڕەحمەتانەی خودا بۆمانی ڕەوانە دەکاتو ئەوە ئێمەین بیناییو هەستو بیرمان سنووردارەو باشییەکانی پشت ڕووداوە ڕواڵەتییەکان نابینین! بۆیە تۆ چیتر کاتەکان بە خەیاڵی کارەساتەکانی ڕابوردوو، بیرکردنەوە لە ئازارە ڕۆشتووەکانو چاوەڕوانی بۆ پێشهاتەکان بێبایەخ مەکە، هەرچی هاتە ڕێمان تیشکێکە لەو ڕەحمەتەی هەمووان وێڵین بە دوایدا، بێئاگا لەوەی بەدەستمان کەوتووەو نازانین چ کاردانەوەیەکمان بۆی هەبێت! بۆیە، پێویستە لە پێش هاتو ڕووداوەکان ڕابمێنینو حیکمەتەکان بدۆزینەوە؛ تا بتوانین فێربینو ئاسایی بین. بۆئەوەی چەپکێك لە سوپاسگوزاری بە سۆزی دڵ بچنینو لە دڵەوە بیدەینە دەست خودایەك کە بێنیازە لە هەموو بوونێك؛ ئەوە هەر ئێمەین نیازمەندی هەموو سیفاتەکانی ئەوین لە هەموو کاتو زەمانێکدا.

# تیشکێك لە ڕەحمەت

شۆخان عەلی



# زیندانییەکە

سایە سەرگەتی



لەو کاتەوە کە درووست کراوە، لە زینداندایە، هەرچەند وا باس دەکات، کە هەندێجار هەستی بە ئازادی کردووە، بەڵام تەنانەت بۆ ساتێکیش ئازادی بە چاو نەبینیوە، ئاخر ئەو لە ئازادیدا دەمرێت.

لەبری ئەوە، خودا کردوویەتی بە بەڕێوەبەری گشتیو ڕاوێژکاری جێبەجێکردنی ئێرە، واتە: ئەم لە زیندانەوە، تەواوی ئەوانەی کە پەیوەندییان پێوەی هەیەو ئازادن، بەڕێوە دەبات، باوەڕ بکە تەنانەت یەکجاریش هیچ ڕەنگێکی نەبینیوە، بەڵام هەمووان ئاڕاستە دەکات لە هەڵبژاردنی جوانترین ڕەنگ، بێئەوەی خۆیان هەست بکەن. بەشێکی تایبەت کردووە بەگۆڕینی هەڵسوکەوتو ژیانی تەواوی ئەندامەکانی، لەگەڵ ئەو هەمووە زیرەکییەشدا، زۆربەی کات خۆشباوەڕە، بۆ نموونە ئەگەر یەکێك لە ئەندامەکانی نەخۆش بوو، بە گوتنی من باشم، خێرا باوەڕ دەکاتو ئەو فایلانەی بۆ دەنێرێت کە لە کاتی باشیدا بۆی ڕەوانە دەکرد. جارێکیان فایلێکی دەنگی بۆ هات، فایلەکە دەیگوت، تۆ زۆر خۆشبەختی، فایلەکەی نارد بۆ بەشی لێکدانەوەو توێژینەوە، ئەم بەشەش دوای بەدواداچوونی وردو زۆر خێرا ڕایگەیاند: (خۆشبەختی لەگەڵ هەندێك لایەنگری ئێمەدا ناگونجێت؛ چونکە ئەو فایلو وێنانەی ئێمە بەدەستمان گەیشتووە، ئاماژە بە حاڵەتی پێچەوانەی خۆشبەختی دەکەن، تێبینی، خۆشبەختی واتە: کارکردنی ئەندامەکانمان لەوپەڕی باشیدا).

بەڕێوەبەر چونکە زۆر دڵسۆزی ئەندامەکانی بوو، بەشی ئەرشیفی کۆمپانیای ڕاسپارد، کە بەشی توێژینەوەو بیرکردنەوە ڕازی بکات، بەهەر نرخێك بێت، ڕێگەیەك بدۆزنەوە، بۆ دروستکردنی هەستی خۆشبەختی؛ چونکە پێویستمان بەکاری زۆر باشی ئەندامەکان هەیە بۆ پێشخستنی ناوچەکە. لەبەرئەوەی زۆر ڕێزی یەکتریان لابوو، بەشی ئەرشیف، بەپێی ئەو یادەوەرییەی کە هەیان بوو، ئەو پێشبینیانەی کە بۆ داهاتوو دەیانکرد، ملیۆنان توێژینەوەیان لەسەر سەدان کارو کاردانەوە کرد، بۆ هەر کارێك کاردانەوەیەکی دروستو نوێیان تۆمارکرد، هۆکاری تەواوی شکستە خراپەکانیان دۆزییەوە، کارو کاتی هەمووانیان دیاری کرد، ئیتر ئەم کۆمپانیایە ئەوەندە پێش کەوت، هەمووان سەرسامی دڵسۆزیی بەڕێوەبەرو سیستەمی هاتوچۆو خەزنکردنی فایلەکان بوون.

ئەمان بوونە پێشەنگ، هەموو ئەو ئەندامانەش کە جاران، ڕەخنەیان لەوە دەگرت، کە زیندانییەك بەڕێوەبەریانە، تێگەیشتن بەدرێژایی کات زیندانییەکە، نازناوی خۆی پاراست، هەموو زیندانییەکانی دونیا، یەك ناویان هەیە، وەك یەك کار دەکەن، بەڵام ئێمە بۆ ناسینەوەیان ناوەکانمان جیا کردووەتەوە، بۆ نموونە بە زیندانییەکەی من دەگوترێ، مێشکی من، زیندانییەکەی تۆش مێشکی تۆیە. ئێستە تۆ چۆن مامەڵە لەگەڵ زیندانییەکەت دەکەیت، سەبارەت بە خۆت، چ فایلێکی بۆ دەنێریت؟

# کانگەی هێز!

بێگەرد فارس



پاشایەك دووانەیەکی هەبوو، نەیدەزانی کامیان پێشتر لەدایك بووە؛ تا بیکاتە جێنشینی خۆی، کاتێك گەورە بوون، بەهۆی زیرەکیو سەرنجڕاکێشیو بەهێزی کەسێتییانەوە هیچ کەسێك جیاوازییان نەدەکردن، ڕۆژێك پاشای باوکیان بانگی هەردووکیانی کردو پێی گوتن: ڕۆڵەکانم ڕۆژێك دێت یەکێك لە ئێوە لەسەر ئەم تەختی شاهانەی من دادەنیشێو فەرمانڕەوای ئەم شانشینە دەگرێتە ئەستۆ، پێویستە ئەوە بزانن کە باری فەرمانڕەوایی زۆر گرانە، بۆیە بڕیارم داوە تاقیتان بکەمەوە؛ بۆئەوەی بزانم کام لە ئێوە توانای هەڵگرتنی ئەو بارە قورسەتان هەیە، لەبەرئەوە دەتاننێرمە سووچێکی دەرەوەی شانشین، ڕاوێژکارەکەم بارێکی زۆرگرانتان دەخاتە سەرشان، کاتێك گەڕانەوە هەرکامێکتان ئەو بارەتان هەڵگرتبوو؛ ئەوا میراتگری تەختی پاشایەتی دەبێت.

هەردوو شازادە بۆ بەجێهێنانی کارەکەیانو کێبڕکێیەکی دۆستانە بەڕێ کەوتن، لە سەرەتای کارەکەیانەوە ڕێکەوتی ئافرەتێکی بە تەمەنی لاوازیان کرد، جەستە بێهێزەکەی توانای هەڵگرتنی ئەو بارەی سەرشانی نەبوو، یەکێك لە شازادەکان پێشنیاری کرد بۆ یارمەتیدانی بوەستن، بەڵام ئەوی دی ڕەتی کردەوەو گوتی: ئێمە باری زۆر گرانتر چاوەڕێمان دەکات، هەر لەوەمان کەم بوو، باری زیاتر مەخەرە سەر شانمان، خێرا بکە با بڕۆین، ئەوەی پێشنیارەکەی ڕەت کردەوە لەسەر ڕۆیشتن بەردەوام بوو بە تەنها، بەڵام براکەی تری مایەوە بۆ یارمەتیدانی ژنە پیرەکە، هەر لەو گەشتەی خۆی چەندین باری تری هاتە سەر ڕێگەیو بە جۆرێك یارمەتیدانی بۆ پیاوێکی نابینا بەتەواوی لەسەر ڕێڕەوی گەشتەکەی دەرچوو.

لە کۆتاییدا گەیشتە لای ئەو ڕاوێژکارەی باوکی کە بۆ ئەو تاقیکردنەوەیە ڕای سپاردبوو؛ بۆئەوەی بگەڕێتەوە بۆ کۆشکی پاشایەتی، بەڵام کاتێ گەیشتەوە لە دەروازەی کۆشکەکە چاوی بە براکەی کەوتەوە پێی گوت: " لە هەڵسوکەوتی تۆ تێناگەم، باری سەر شانی من زۆر گران بوو، تۆ ئەو هێزەت لە کوێوە هێناوە بۆ هەڵگرتنی ئەو بارەی کەسانی تر؟؟" پاشای داهاتوو بە براکەی گوت: کاتێك یارمەتیی کەسانی ترم دا لە هەڵگرتنی باری سەرشانیان، ئیتر باری سەرشانم سووك بوو"



# خانووەکەمان

ن: عەزیز نەسین
و: ئیبراهیم بهاءالدین خەتەیی

تەنانەت خاوەنی ئەم خانووەش، نەیدەزانی ژمارەی ژوورەکانی چەندە، ئەو خانووەی لە باپیرانەوە بۆی ماوەتەوە، سەردەمێکی زۆر بەسەر درووستکردنیدا تێپەڕیوە، ئەو خانووە لە چەندین ژووری فراوانو هۆڵ پێکهاتووە، خاوەنی ئەم خانووە لەگەڵ هاوسەرو خێزانەکەیدا، بەئاسوودەیی دەژیان، سەرەڕای ئەوەی ئەم خانووە بەرە بەرە ژوورەکانی کۆن دەبوون، بەڵام خاوەنەکەی بەشانازییەوە دەیگوت: ئەم خانووە میراتی باوکو باپیرانی ئێمەیە.

هەرکاتێك باسی لەو خانووە دەکرد، هەردوو جەمسەری دەمی بەگوێچکەکانی دەگەیشتن. دوای ئەوەی نهۆمی سەرەوە بەتەواوی ڕووخا، ماڵەکەیان گواستەوە بۆ نهۆمی ناوەڕاست. ئینجا دوای ئەوە، گواستیانەوە بۆ ناو هۆڵەکەو ژوورەکانی دەوروبەری. لەبەرئەوەی ژوورەکان زۆر بوون، هەرکاتێك ژوورێك دەڕووخا، دەیانگواستەوە بۆ ژوورێکی تر.

ڕۆژێکیان دراوسێ یەکیان گوتی: خانووەکەی ئێمە بچووکەو بەشمان ناکات، بۆیە من بۆ ئەوە هاتووم، ئەگەر ژوورێکتان هەبێت بۆ کرێ پێمانی بدەن.

خاوەنی خانووە گەورەکە، بەباشی زانی ژوورێکیان بەکرێ پێ بداتو بە پارەکەی، پلیکانەو دەرگاکان چاك بکاتەوە، بۆیە گوتی: دەتوانن بۆ خۆتان ژوورێك دەستنیشان بکەنو تێیدا بژین.

دراوسێکە ژوورێکی لەو خانووە گەورەیە بەکرێ گرت. دوای ماوەیەك کرێچییەکی تر هاتو گوتی: بیستوومە ژوورەکانی خانووەکەت بە کرێ دەدەیت، دەکرێت ژوورێکیش بە ئێمە بدەیت؟ خاوەن ماڵ قبووڵی کردو ژوورێکی پێ دان. دوای ماوەیەك دراوسێیەکی تریان هاتو گوتی: حەوشی خانووەکەتان زۆر گەورەیەو ئێوەش بەکاری ناهێنن، بۆچی چەند دۆنمێك بەکرێ نادەن بە من؟

خاوەن خانووەکە قبووڵی کرد..

دوای ماوەیەك یەکێك لە دراوسێکانی گوتی:

- ئاوی بیرەکەمان کەمی کردووە، دەتوانین سوود لە بیرەکەی ئێوە وەربگرین؟ خانەوادەکەی ئێمە ژمارەیان زۆرەو بەشمان ناکات، هەروەها منیش لە جیاتی ئەوە پارەتان پێ دەدەم. خاوەن خانوو، بیرۆکەکەی بەباش زانیو قبووڵی کرد.

یەکێك لە کرێچییەکان گوتی:

- پێویستمان بە ڕێگایەك هەیە بەناو باخەکەی ئێوەدا بڕوات، لەبەر ئەوەی ناکرێت لەخانووەکەماندا بینو لەهەمان کاتدا بۆ ژوورەکەی خانووی ئێوە هاموشۆ بکەینو ڕێگایەك نەبێت لە نێوانیاندا.

خاوەن خانوو گوتی:

- هەق بە ئێوەیە، ڕێگایەکی بۆ درووست کردن.

دانیشتوانی خانووەکە گوتیان:

- بۆ هەریەکەمان ژوورێك بەشمان ناکات بۆیە دەمانەوێت هەریەکێکمان ژوورێکی دانیشتنیش بەکرێ بگرین.

- بۆچی نا.. هەرچۆنێك بێت خانووەکە ژووری زۆری تێدایە.

دوای ماوەیەك گوتیان:

- ژووری نووستنمان دەوێت..

خاوەن خانوو گوتی:

- ئەوە مافی خۆتانە، کامە ژوورتان بە دڵە هەڵیبژێرن.

- چێشتخانەمان دەوێت.

- دەتوانن بەکاری بێنن.

خاوەن خانوو بەوەرگرتنی کرێی ژوورەکان زەنگین بوو، هاوسەرو منداڵەکانی پارەیان لە بەردەستدا بوو، بە ئارەزووی خۆیان، تەخشانو پەخشانیان دەکرد. ئەویش لە شانازیی خۆی بەردەوام بوو هەمیشە دەیگوت: خانووەکەمان!

گوتیان: ئەگەر بیرەکان نۆژەن نەکرێنەوە، بێ ئاو دەمێنینەوە.

خاوەن خانوو گوتی: من پارەم نییە.

- ئێمە ئەوە نازانین، ئێمە بە ڕێکوپێکی کرێ بەتۆ دەدەین، بۆیە پێویستە لەسەرت بیرەکان نۆژەن بکەیتەوە، بەڵام دەتوانین خزمەتێکت پێشکەش بکەینو پارەت بەقەرزی بە سوود پێ بدەین.

خاوەن خانوو گوتی:

-سوپاستان دەکەم، هەرگیز ئەو چاکەیەتان لەبیر ناکەم.

بیرەکان نۆژەن کرانەوە.

دوای ماوەیەك دانیشتوانی خانووەکە زیادی کردو ئاوی بیرەکە بەشیانی نەدەکرد گوتیان:

- بیری تر لێ بدە.

- هەقی خۆتانە، بەڵام پارەی زیادم نییە.

- قەرزی بە سوودت پێ دەدەین، زۆر ئاساییە.

خاوەن خانوو بیری کردەوە: بیرەکە دەبێتە موڵکی خۆی،

هەرچەنـدە پرۆژەكە بریتی بوو لە سێ بیر، بـەڵام لەبەر ئەوەی ناچار بووهەندێك لەو پارەیەی كە بە سـوو قەرزی كردبوو، بدات بە هاوسـەرەكەی‌و كچەكانی دوای ئەوەی ویستیان بەهەمان شێوەی ئافرەتە كرێچییەكان، لەسـەر مۆدێل ژیان بەسـەر بەرن، بۆیە دوو بیری تری لێدا، بەڵام بیری سێیەمی بۆ تەواو نەكرا.

دوای ماوەیەك یەكێك لە كرێچییەكان گوتی:

- ڕێگاكە تێك چووە، بۆیە دەمانەوێت بۆمانی چاك بكەیتەوە.

خاوەن ماڵ گوتی: لە توانامدا نییە.

كرێچییەكە گوتی:

- تـۆ ناچـاری ئەوەمـان بۆ بكەیـت، لەبەر ئـەوەی ئێمە بە ڕێكوپێكی‌و مانگانە كرێیەكەت پێ دەدەین.

- پارەم نییە.

- قەرزت پێ دەدەین ئەگەر بتەوێت.

خاوەن ماڵ دڵخۆش بوو گوتی: پارەم پێ بدەن.

گوتیـان: لەبەرئەوەی تۆ قەرزەكەی پێشـووترت بە هاوسـەرو منداڵەكانـت دا؛ بۆئەوەی شـتی بێبایەخی پێ بكڕن، بڕیارمان داوە خۆمان چاودێریی خەرجییەكانی تۆ بكەین.

كێشـە نییـە... ئەو ڕێگایـەی چاكی دەكاتەوە هـی خۆیەتی، خانووەكـەش خانـووی خۆیەتـی، بۆیە لـە خۆشـیاندا چاوەكانی دەبریسكانەوەو هەردوو جەمسەری دەمی بە گوێچكەكانی دەگەیشت كاتێك دەیگوت: خانووەكەمان!

كرێچی گوتی:

- بنمیچەكە شێدارەو ناتوانین لە ژێریدا دابنیشین.

خاوەن خانوو گوتی: پارەم نییە.

- ژوورێكـی ترمـان پـێ بدەو بـە پارەكـەی بنمیچەكە چاك بكەرەوە. كرێچییەكان گوتیان:

- پلیكانـەكان لاواز بـوون، سـێ ژووری ترمـان پـێ بدەو بە پارەكەی پلیكانەكان چاك بكەرەوە.

خاوەن ماڵ گوتی: خانووەكەمان ئێستا تەواو نۆژەن بووەوە.

كرێچی گوتی: ئاوەڕۆكان تێكچوون.

هیـچ ژوورێك نەماوە بۆ كرێ، بۆیە خاوەن ماڵ بارگەیان تێك نـاو چوونە نهۆمی خوارەوە. دوای ئـەوەی ئەو نهۆمەیان بە كرێدا پارەكەیان لە نۆژەنكردنەوەی ئاوەڕۆكان خەرج كرد.

- بۆیەی ژوورەكان گونجاو نییە.

پارەی نەبـوو، ئەو پارەیەی وەری دەگرت لـە نۆژەنكردنەوەی ئاوەڕۆكان خەرجی كردو هاوسـەرو منداڵەكانیشی ئێستا خەرجییان زۆر زیادی كردووە.

وەرزی هاوین هاتو دوای ئەوەی هەموو ژوورەكانی خانووەكەی بەكرێدابوو، خاوەن ماڵ لە باخچەی خانووەكەدا كووخێكی درووست كرد.

- ئێستا ئیتر خانووەكەمان لە خانوو دەچێت.

كرێچی گوتی:

- خانووەكە پێویستی بە كاغەزی دیوار هەیە.

- ناتوانم هیچ بكەم

- خانوو خانووی خۆتە.

ڕاسـتە خانووی خۆیەتـی، بەڵام هیچ پارەیەكـی نییە، ئەگەر داواكارییەكانیـان جێبەجـێ نـەكات، كرێچییەكان لـە خانووەكە دەڕۆن‌و داوای ئەو هەموو قەرزەی لێ دەكەنەوە.

- كرێچییەكان گوتیان:

- ئەگـەر ناتەوێـت دیوارەكانمان بۆ جـوان بكەیت، خانووەكە چۆڵ دەكەین.

ئیتـر بەناچـاری، هاوسـەری خـاوەن ماڵ وەك چێشـتلێنەر لەخانووەكـەدا كاری دەكردو منداڵەكانیشـی بوون بـە خزمەتكاری كرێچییەكان.

بەو پارەیەی كە وەریان گرت، كاغەزی دیواریان كڕی.

ئێسـتا خانووە كۆنەكە نوێ بۆتەوەو خاوەن خانووەكەش وەك نەریتی هەمیشـەیی، شـانازی بـەو خانووەوە دەكـردو لەدوورەوە سەیری دەكرد.

كرێچییەكان خاوەن ماڵیان سەرزەنشت كردو پێیان گوت:

- تۆ هەرگیز ڕێز لە هاوسـەرەكەت ناگریـت، پێڵاوێكی تازەی بۆ بكڕە، بۆ كچەكانیشـت جـلو گۆرەویی تازە بكڕە لە جیاتی ئەو جلانە، ئێمە نامانەوێت ئەو جۆرە دیمەنە ناحەزانە ببینین.

خاوەن ماڵ گوتی:

- هەق بە ئێوەیە، بەڵام پارەم نییە.

- هاوسـەر، هاوسـەری خۆتەو منداڵەكانیش جگەرگۆشەی تۆن، زۆر شـوورەییە بۆ تـۆ، بەڵام سـەرەڕای ئەوەش ئێمـە پارەتیت دەدەین...خاوەن ماڵ سوپاسی كردن.

لـە یەكێـك لە ڕۆژەكانی زستاندا، كاتێك خـاوەن ماڵ لەگەڵ كوڕەكەی لەناو كووخەكەیدا دانیشـتبوو لەوكاتەی هاوسـەرەكەی‌و كچەكانی بە خزمەتی كرێچییەكانەوە سەرقاڵ بوون، لە پەنجەرەی كووخەكەوە سەیرێكی خانووەكەی خۆی كردو بە كوڕەكەی گوت:

بەڕاستی ئێستا خانووەكەمان زۆر جوان بووە.

كوڕەكەی پرسی:

- كامە خانوو؟؟؟!!

- ئێمە چەند خانوومان هەیە... ئەو خانووەی لەبەرچاوتە!

كوڕەكەی گوتی: باوكە وا دیارە ئیتر ئەو خانووە هی ئێمە نییە.

لەناكاو باوكی توورە بوو هاواری كرد: تۆ چی دەڵێی؟! خانووی ئێمە نییە؟! چۆن دەتوانی وا بڵێی؟!

كوڕەكە گوتی: هەست دەكەم ئەو خانووە هی ئێمە نییە ..لەناوی دانانیشین‌و لەباخچەكەیدا پیاسە ناكەین‌و لە ئاوەكەی ناخۆینەوە..

پیاوەكە كاغەزێكی كۆنی چاپكراوی لە گیرفانی دەرهێناو هاواری كرد: سـەیر بكە.. ئەوە تاپۆكەیەتـی، بەناوی خۆم تۆماركراوە، من باجەكەی دەدەم.. لێرە بڕۆ دەرەوە هەی ناپاك، تۆ كوڕی من نیت.

لەو كاتەی كوڕەكە سـەری دانەواندبـوو، لە كووخەكە دەچووە دەرەوە، باوكی هاواری دەكردو دەیگوت:

- هەی كوڕی ناپاك.. من لەتۆ بێبەریم، ئەوە تاپۆی خانووەكەیە.. بەناوی منەو لە گیرفانی منە!!

ئێستا ئەو خانووەتان ناسی كە هەموومان تیایدا دەژین، وابزانم ئەو خانووە لە باپیرانەوە بۆمان ماوەتەوە!




# لە كارگوزارییەوە، بۆ مامۆستای زانكۆ

ڕەنگە بە خوێندنەوەی چیرۆكی ژیانم سەرسام ببیت، لەوانەیە وا بزانیت ئەمە چیرۆكێكی خەیاڵی بێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە ژیانو گوزەرانی ڕاستەقینەی منە، كە بە دەزووی سەختییەكانی ژیانم چنیومە، من هەرگیز نائومێدو بێهیوا نەبووم، لەبەرئەوەی هەمیشە پشتم بە كردگارم بەستووە. بە هێزی باوەڕ، گڕو تینم بە هیواكانم داوە.

سەرەتای تەمەنی منداڵیم، لێوانلێو بوو لە ناڕەحەتیو دەردسەری، لە خێزانێكی زۆر هەژارو كەمدەرامەت ژیانم دەگوزەراند، كە زۆربەی ڕۆژ بە دەست برسێتییەوە دەمانناڵاند. هەرگیز وەكو منداڵان، تامی شكولاتەو شیرینییەكی بەتامم نەكردووە، بەردەوام چاوەڕوانی ڕۆژانی جەژنمان دەكرد؛ چونكە تەنها لە جەژنەكاندا تامی گۆشتو میوەو شیرینیمان دەكرد.

خێزانێك بووین، هیچ كاممان بیرمان لەوی دی نەدەكردەوە، هەر یەكەمان جیهانێكی تایبەتی هەبوو، هەر یەكەمان بە كاری خۆیەوە سەرقاڵ بوو، بە جۆرێك كە پێنووسەكەم شەرم لە نووسینەوەی دەكات.

باوكم بە مووچەیەكی كەم، كارگوزار بوو لە پێشانگایەكی ئۆتۆمبێل، بەشێوەیەك مووچەكەی بەشی نیوەی مانگی دەكرد، هاوكات زۆر خراپ مامەڵەی لەگەڵدا دەكردین، تەنانەت بە هۆی بەكارهێنانی ماددەی هۆشبەرەوە، هەمیشە بە ڕێگای زیندانەوە بوو، ساڵانە چەند جارێك دەستگیر دەكراو ئازاد دەكرا، دایكم ئافرەتێكی باشو میهرەبان بوو، بەڵام هیچ دەسەڵاتێكی نەبوو، هەمیشە چاومان لە دەستی دراوسێكانمان بوو؛ تا شتێكمان بۆ بهێنن. من بۆ حاڵی ئەم خێزانە لێك هەڵوەشاوە زۆر خەمم دەخوارد، هەمووان لە چواری بنەڕەتی دەستیان لە خوێندن هەڵگرت، بەڵام من گرنگیم بە خوێندن داو بەردەوام بوومو هەوڵی پلەی بەرزم دەدا، بەڵام گرنگیدانم بە خوێندن بەردەوام نەبوو؛ چونكە ئیدی ڕۆژانی نەهامەتیم دەستی پێ كرد، بەشێوەیەك ئەگەر باوەڕێكی پتەوم نەبووایە، ڕەنگە نەمتوانیایە تێی پەڕێنم. ئەو ساڵە بە پلەیەكی باش سێی ناوەندیم بڕی، كە من یەكەم كەسی خێزانەكەم بووم، بگەمە ئەو قۆناغە، تەمەنم پانزە ساڵان بوو، بازرگانێكی تەمەن شەست ساڵ، خوازبێنی منی لە باوكم كردبوو، كە هەم شەكرەی بوو، هەم گوشاری خوێن، هاوكات ئالوودەی ماددەی هۆشبەر بوو، بەڵام دەوڵەمەندو خاوەن سامان بوو، هەر لەبەر ئەوە باوكمو دایكم دەستبەجێ بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە ڕەزامەندییان نیشان دا، بێئەوەی هیچ پرسێك بە من بكەن، كاتێك هەواڵەكەم بیست، بەتوندی بەسەریاندا قیژاندمو گوتم من نامەوێت هاوسەرگیری بكەم، دەمەوێت درێژە بە خوێندن بدەم، خوشكە گەورەكەمی پێ بدەن.

بەڵام هاوارو قیژەم سوودی نەبوو، هەر ئەو شەوە مارەیان بڕیم، دەزانن یەكەم شت لە نێو جانتاكەم دانا چی بوو، كتێبو دەفتەرەكانم بوو!

ئیدی بەڕێكەوتم بۆ ماڵێكی نوێ، ببوورن بۆ زیندانێكی نوێ، بهێننە پێش چاوی خۆتان، كچێكی پانزە ساڵ لە ماڵێكدا لەگەڵ پیاوێكی شەست ساڵ، دەبێت ژیانی چۆن بێت؟!

پێنج ساڵ بەسەر هاوسەرگیریمدا تێپەڕی، نرخی چاوچنۆكی چاوبرسێتی خێزانەكەم دا، ئەوان پارەی هاوسەرەكەم چاوی كوێر كردبوون! ئەو پێنج ساڵەی تەمەنم تامو چێژی هەموو جۆرە ناڕەحەتییەكانم چەشت، هەر لە لێدانەوە بە نەعلو قەمچی، ڕۆژانە وەكو دەرمانی دكتۆر، چوونە دەرەوە قەدەغە بوو، ڕەزیلیو دڵپیسیو ..هتد، لە سەرروو هەموویانەوە، ڕێگەی نەدا درێژە بە خوێندن بدەم، لە ئەنجامی خەمو پەژارە، وەكو پەیكەرم لێ هاتبوو، بەڵام لە لایەكی دیكەوە، خودا گیان لەو ماوەیەدا دوو كوڕو كچێكی پێبەخشیم، كە ئەوە نیعمەتێكی گەورەبوو بۆ من، ڕۆژانە بەوانەوە سەرقاڵ بووم، باوكیان لە لێدانو سزادانی منداڵەكانیشم درێغی نەدەكرد، هەموو شەوێك بەسەر خۆشی دەهاتەوەو هەمووانی داركاری دەكرد، پاشان دەخەوت، هەر شەوێك ماددەی هۆشبەری دەستنەكەوتایە منو منالەكانی دەكردە دەرەوەو دەبوا تا بەیانی لەسەر شەقام بمێنینەوە. زۆرجاریش دراوسێكانمان بانگهێشتیان دەكردینو دەیانبردینەوە ماڵی خۆیان.

شەوێكیان زۆر لە خودا پاڕامەوە؛ تا لەو بارودۆخە دژوارە ڕزگارمان بكات، زۆری پێنەچوو خودا نزاكەی گیرا كردم، گوێمان بە دەنگو هاواری دراوسێكانمان زرنگایەوە، بانگیان كرد دایكی فلان هاوسەرەكەت، هاوسەرەكەت، بەپەلە بەرەو دەنگەكە ڕۆیشتم، تا بزانم چی ڕووی داوە، بینیم هاوسەرەكەم هەموو جلەكانی خەڵتانی خوێن بووەو بە دەست پۆلیسەكانەوەیە، كاتێك پرسیم چی ڕوو دەدا؟ گوتیان لەسەر كرێی هێرۆیین لەگەڵ هاوڕێكەی بووەتە دەنگەدەنگیو هاوسەرەكەت چەقۆیەكی لێداوەو دەستبەجێ هاوڕێكەی گیانی دەرچووە.

سەرنج بدەن هاوسەرەكەم، لێوەكانی سپی بووبوون، چاوەكانی ئەبڵەق بووبوون، سەیری خەڵكەكەی دەكرد، بەڵام من نەمدەزانی ئەوە ئەو ساتە خۆشەیە كە چاوەڕێ بووم، یان نیگەران بم بەوەی كە هاوسەرەكەم دەچێتە زیندان، لەو كاتەشدا بیرم لە یادەوەرییە سەختەكانی ژیانی هاوسەریم دەكردەوە، بیری تێهەڵدانو

سـووکایەتییەکانیم دەکردەوە، ئیدی سوپاسـی خودام کرد لەسەر ئەوەی ئەو درندەیەی لە کۆڵ کردوومەتەوە.

تەنها دوای یەك هەفتەو پێش ئەوەی دادگایی بکرێت، فەرمانی دادپەروەری ئاسـمانی بۆ دەرچوو، لە نێو زیندان تووشـی نەزیفی دەماغ دەبێتو بەو هۆیەوە گیان لەدەست دەدات!

دوای دوو سـاڵ بۆ یەکەمجار ماڵی باوکم هاتن بۆ سـەردانم، تـا سەرەخۆشـیم لێ بکـەن! یەکەم قسـە تەنانەت پێش سـڵاو، دایکم گوتی: خوا لێی خۆش بێت، ئایا میراتی بەجێ هێشـتووە؟! ئەگەر لەبەر ترسـی خودا نەبووایە، دەمکردە دەرەوە، کاتێك پێم ڕاگەیاندن کە هاوسـەرەکەم نەك هیچی بەجێ نەهێشتووە، بەڵکو قەرزاریشـە، ئیدی ڕۆیشتنو هەر لێیان نەپرسیمەوە، نەبادا خۆمو منداڵەکانم ببین بە بار بەسەریانەوە!

دانیشـتمو کەمێك بیرم کردەوە، ئافرەتێکی گەنجی بیست ساڵان، خاوەنی سێ منداڵ، هیچ سەرچاوەیەکی بژێویم نییە، تەنها دوو ڕێگە لە بەردەممدا هەیە: هەوڵدانو تێکۆشانو ئارامگرتن. یاخود جارێکی دیکە هاوسەرگیری بکەمەوەو خۆم لەو بەرپرسیارێتییە دەرباز بکەم!

بەبـێ دوودڵی ڕێگەی یەکەمم هەڵبژارد، یەکەم کار کە کردم، ئەوە بوو هەموو ئاڵتوونەکانم فرۆشت، ئەو ماڵەم جێهێشـت، کە هەموو سووچێکی پڕببوو لە یادەوەریی ناخۆش، خۆمو منداڵەکانم ڕۆیشـتین بۆ شـارێکی دیکەو خانوویەکـی بچکۆلانەمان بە کرێ گرت، بەڵام زۆر خۆشـتربوو لەو کۆشـکەی کە پێنج سـاڵ تێیدا زیندانی بووم؛ چونکە خۆم چارەنووسی خۆم دیاری دەکردو کەس سووکایەتی پێ نەدەکردین.

سـەرەتا دەسـتم کـرد بە گـەڕان بـەدوای کارێکـی گونجاو، خـودا دەروازەی خێری لێ کردمەوە، دراوسـێکانم کەسـانی زۆر بـاش بوون، بەشـێوەیەك هاوکارم بوون، کە بـاوەڕ ناکرێت. هەر پێداویسـتییەکمان هەبووایە، ئـەوان هاوکارییان دەکردینو بۆیان دابین دەکردین، دواجار کارێکی حکومیم دۆزییەوە، بوومە کارگوزار لـە ئامادەییەکی کچان، کە نزیکی ماڵی خۆمان بوو، هەرگیز بیرم ناچێت، یەکەم مووچە کە وەرمگرت لە خۆشیدا زۆر گریام، دواتر سوپاسـی خودام لەسەر کرد، کە ئەو ڕزقەی پێ بەخشیمو ئیدی بۆ کەس نابین بە ئەرك.

هـەر ئـەو ڕۆژە منداڵەکانم بردە بازاڕو جلـی جوانو یاریو خواردنـی خۆشـم بۆ کڕیـن، دوای چـوار مانگ بـۆ یەکەم جار مریشـکم بۆ منداڵەکانم لێ نا، ئەو ئێوارەیە لە ماڵی ئێمە جەژن بوو، خۆشییەك بوو، کە ناتوانم وێنای بکەم.

سـاڵێکی تەواو تێپەڕی، بە هۆی دڵسـۆزیمەوە لـە کارەکەمدا ڕێزی زۆری بەڕێوەبەرو مامۆستاکانو خۆشەویستی خوێندکارەکانم بەدەست هێنا!

ڕۆژێکیان لە خۆم پرسـی، باشـە بۆچی دەسـت نەکەمەوە بە خوێندن، بـە تایبەت کە من لە خوێندنگەیەکـی ئامادەیی دەوام دەکـەم، ئـەم پێشـنیارەم لای بەڕێوەبـەری قوتابخانە باسـکرد، بەڕێوەبەر زۆر هانی داموو دەستخۆشی لێ کردم، ئیدی دەستم کرد بـە خوێندنو هـاوکات کارگوزاری خوێندنگەش بووم، نەمهێشـت خوێندنەکەم هیچ کاریگەری لەسـەر کارەکەم دروست بکات، لە ماوەی سێ سـاڵدا بە نمرەی ٩٧٪ توانیم ئامادەیی تەواو بکەم، لە خۆشـیدا زۆر گریام، ئەوە سەرەتای دەروازەیەکی خێر بوو، نزیك بـوو بەرهەمـی ماندووبوونم پێ بگات، ئیدی لـە کارگوزارییەوە بوومە نووسەر لە فەرمانگەیەکی حکومی، بە مووچەیەکی باشتر، هـاوکات فۆڕمـم پڕ کردەوە؛ تـا لە زانکۆ وەربگیرێم، لە بەشـی پەروەردەی ئیسلامی، خانووەکەم گۆڕی، خانوویەکی گەورەترمان بەکرێ گرت، منداڵەکانیشم هەموو زۆر زیرەك بوون لە قوتابخانە، هەوڵم دا خۆشـترین ژیانیان بۆ دابین بکـەم، زۆرجار دەچووینە گەشـتو سـەیرانو ژیانێکی زۆر خۆشـمان پێکەوە بەسەر دەبرد، دوای چـوار سـاڵ توانیم بڕوانامـەی بەکالۆریۆس بـە پلەی باڵا بەدەسـت بهێنـم، دوای ئەوە سـوپاس بـۆ خودا لـە ئامادەییەك بووم بە مامۆسـتا، کوڕە گەورەکەم تەمەنی بووە سـیانزە سـاڵ، ڕۆژێکیـان باوەشـی پێدا کردمو گوتی: تـۆ گەورەترین دایکی، من شـانازیت پێوە دەکەم! هەمووومان یەکتریمان لە باوەش گرتو لە خۆشیدا چاوەکانمان ئەسرینیان لێ دەباری، بۆ یەکەمجار پلەیەکی گەورەم بەدەست هێنا، لە کارگوزارییەوە بوومە مامۆستا، بەشێکی مووچەکەم تەرخان کردبوو بۆ پێداویستی منداڵەکانم، بەشێکیشی بۆ بژێوی ژیانمان، بەشێکیشـم تەرخـان کردبوو بۆ یارمەتیدانی هەژاران.

هەر ئەو سـاڵە فۆڕمی ماجسـتێرم پڕ کـردەوە، لەبەر بەرزی نمرەکانم هەر زوو لە خوێندنی ماجستێر وەرگیرام، دوای دوو ساڵ توانیم بڕوامەی ماجستێر دووبارە بە پلەی باڵا بەدەست بهێنم!

پاشان فۆڕمی دکتۆرام پڕ کردەوەو دەستم کرد بە خوێندن بۆ بە دەستهێنانی بڕوانامەی دکتۆرا، ئەو ساڵانە بۆ من زۆر سەخت بوو، لە لایەك دەمخوێند، لە لایەك دایکی سێ منداڵ بوومو زۆر گرنگیم پێ دەدان، هاوکات مامۆستاش بووم.. بەڵام لە کۆتاییدا توانیم بڕوانامەی دکتۆرا بەدەست بهێنمو بوومە مامۆستای زانکۆ، ئەو تەمەنم ٣٧ ساڵ بوو، دەزانن ئەو کاتەی بڕوانامەکەم وەرگرت بیرم لە چی دەکردەوە؟

بیـرم لە دایکم دەکـردەوە، ئەگەر دایکم ئەم دیمەنە ببینێت، ئایا دەبێت لە خۆشـیدا دەست بکاتە گریان، یان دووبارە پرسیارم لێ بکاتەوەو بڵێ ئێستا مووچەکەت چەندە؟!

بەڵام خۆ من هەرگیز نەمدەویست ئازاری دایکو باوکم بدەم، نەمدەویسـت پەیوەندییان لەگەڵ بپچڕێنم، لـەو ماوەیەدا چەند جار سـەردانم کردبوون، بەڵام ئەوان نەگۆڕابوون هەروەکو خۆیان بوون. هەرچەندە باوکم لە ژیاندا نەمابوو، بەڵام خوشکو براکانم هەر لەسـەر هەمان ڕەوشـتە خراپەکانی جارانیـان بوون، ناچار بۆ سـەلامەتیی منداڵەکانم، سـەردانی ئەوانـم کۆتایی پێ هێناو نەدەرۆیشتین بۆ ماڵیان.

دواجـار پارەیەکی باشـم کۆکردەوە، زەوییەکم کڕیو دەسـتم کرد بە دروستکردنی خانوویەکی دوو نهۆمی، لە کۆتاییدا بووینە خاوەنی خانوی خۆمان.

ژیـان بـۆت پێدەکەنێـت، دوای بەرێکردنی سـەختییەکانی، ئێسـتا هەواڵی ژیانی خۆمو منداڵکانمتان پێ بڵێم، من مامۆستای زانکـۆم، هاوکات خاوەنی مەڵبەندێکی کۆمەڵایەتیم، خزمەتکارو شـۆفێرم هەیە، کوڕە گەورەکەم بووە بە پزیشـك، کوڕی دووەمم بووەتە ئەندازیاری شارستانی، کچەکەشم بووەتە پزیشکی منداڵان، هەموویان هاوسەرگیریان کردووەو خاوەن منداڵن، من لەگەڵ کوڕە گەورەکەم دادەنیشم، ماڵمان لێوانلێوە لە خۆشیو پێکەنین، لەگەڵ نەوەکانـم کاتێکی خۆش بەسـەر دەبەین! ئێسـتا من تەمەنم ٥٥ سـاڵە، ئەم چیرۆکەش پێشکەش بە هەموو ئەو کەسانەی تووشی بێهیوایی بوون!



# نامە نوورییەکان

## نامەی شەست و یەک

مامۆستاگیان، نامەی ئەم جارەت جیاواز بوو، لەبارەی کەسێکەوە دوایت، کە هەموو پیتێك لە ژیانی ئەو مرۆڤە، تەزوو بە ڕۆحو دڵ دێنێت!

لەگەڵ نامەکەی جەنابت، چوومە نێو جیهانێکی سەیر، دەبێت ژیان لەگەڵ خودی ئەو پەیامبەرە چۆن بووبێت؟!

دەبێت خەندەیەك هەبێت، وەکوو خەندەی ئەو، دەبێ چرپەیەك هەبێت، ناسکتر لە چرپەی ئەو، دەبێت بۆیەك هەبێت، خۆشتر لە بۆی ئەو؟!

زۆرم هەڵوێستە کرد لەسەر ئایەتی "وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾" الأنبیاء....

سەرسام بووم، چەندم کرد نەمتوانی بگەمە دەریای میهری کەسێك، کە خوداوەند بۆ هەموو جیهانی بە ڕەحمەت ڕەوانە کردووە!

مرۆڤێك، بەتەنێ یەك مرۆڤ، خودا بیکاتە میهرو بەزەیی‌و ڕەحمەت بۆ هەموو جیهان بۆ هەتاهەتا! دەبێت چی میهرەبانێك بووبیت خودایە!!

ئازیزم، بەڕاستی هەڵوێستەکەت زۆر جوانە، میهری بەشی هەموو سەر زەوی بکات، تا ڕۆژی قیامەت.. دەبێ نەك دەریا، ئۆقیانووسی میهربێ!

دەستی نەرمی، هەستی گەرمی، با لە زاری هاوەڵانییەوە ببیستین.

ئەنەس دەفەرموێت: هیچ ئاوریشمێکم دەست لێ نەداوە، نەرمتربێ لەنێو لەپی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)و هیچ بۆنێکیشم نەکردووە، خۆشتر بێت لە بۆنی گوڵاوی خاتەمی

پێغەمبەران (سەلاتو سەلامی خودای لێ بێت).. البخاري

دەزانی ئەزیزم، ئەنەس چی دی دەڵێت؟ دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەرم کردووە، هەرگیز ڕۆژێك بەرامبەرم ئۆفێکی نەکردووە! بەرامبەر کارێك کردبێتم، نەیفەرمووە: بۆ کردت؟ یا کارێکم نەکردبێ، نەیفەرمووە: بۆ نەتکرد؟ البخاري و مسلم

لەنێو نوێژدا، لە کاتی موناجاتی ئیلاهیدا، لە سوژدەو کڕنووشدا بۆ خودا، لە پیرۆزترینو گەورەترین ساتەکانی پەیوەندی لەگەڵ خودادا، کاتێك گوێی لە دەنگی گریانی منداڵێك دەبوو، نوێژەکەی کورت دەکردەوە، دەزانی بۆ؟ لە کاتێکدا دەیویست نوێژەکە درێژ بکاتەوە، دەیفەرموو: (مما أعلم من شدة وجد أمه ببكائه) البخاري.... لەبەر ئەوەی دەمزانی دایکی، دڵی ژان دەکات بە گریانی منداڵەکەی!

لەسەر مینبەر، لە ڕۆژی هەینیدا،لەو کاتە گرنگەدا، کاتێك وتار دەدات بۆ هاوەڵانی حەسەنو حوسێن دێنە نێو مزگەوت، هەردووك کراسی سووریان لەبەر بووەو بەنێو ڕیزەکاندا دەهاتنو جارجار پێیان هەڵدەکەوت، پەیامبەر خۆی بۆ نەگیرا، لە ترسی ئەوەی ئازاریان پێ بگات، دابەزیو هەردووکی هەڵگرتن بۆ لای خۆیو پاشان دەستی بە وتارەکەی کردو فەرمووی «صدق الله إنما أموالكم وأولادكم فتنة» ئەو دوانەم بینی، کراسەکەیان لە قاچیان گیر دەبوو، خۆم بۆ نەگیرا، تا قسەکانم بڕیو هەڵمگرتن. (االنسائي بإسناد صحيح)

لە نوێژی جەماعەتدا، جارێك هێندە لە سوژدەدا مایەوە، هاوەڵانی ترسان شتێك ڕووی دابێتو پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێت) شتێکی لێ هاتبێت!

دواتر کە پرسیاریان لێ کرد، فەرمووی: نەخێر، هیچ لەوانە ڕووی نەدابوو، وەلێ حەسەنی کوڕم، چووبووە سەر پشتم، حەزم نەکرد پەلەی لێ بکەم، بە ئارەزووی خۆی دێتە خوارێ! (النسائي بإسناد صحيح)

سەیرە سەدان کەس لەدوای پەیامبەر، لە سوژدەدا دەمێننەوە، تا منداڵێك بە دڵی خۆی، تێر لەسەر پشتی باپیرەی یاری بکات!

ئەو باپیرەیەش کێیە؟ پەیامبەری ئاخری زەمان موحەممەدە (درووودی خودای لێ بێت)!

بۆ چەند چرکەیەك چاوەکانت دابخەو بە خەیاڵ بچۆرە خزمەتی مزگەوتی مەدینەی مونەوەرەو بیهێنە پێش چاوت، قامەت کرا، پۆل پۆل هاوەڵان دەستەو نەزەر ڕاوەستاون سەدای (الله اكبر الله اكبر، لا إله الا الله)یە لەناکاو بەدەرکەوت بەدری مونەوەر، خۆری دەرەخشانو سیراجی مونیر دێتە ژووری....

بەڵام کێی لەسەر شانە؟! کێی هەڵگرتووە لەسەر کۆڵی موبارەکی؟!کیژۆڵەیەك گەیشتۆتە بەرزترین لوتکە!

دەستەکانی نەگرتبوو! وەدوی خۆیدا ڕای نەدەکێشا! لە عارەبانەکەیدا پاڵی پێوە نەدەدنا! نا، کردبوویە کۆڵی، پێیەکانی بەسەر سنگی موبارەکیدا شۆڕبووبوونەوە!

دەستەکانی لە سەرو گەردنی ئەو باپیرە میهرەبانە ئاڵاندبوو!

ئەوە (ئومامە)یە کچی زەینەب، کچەزای پێغەمبەرە!

ئەوە ڕێزو گەورەییو پێدانی گەورەترین بڕوانامەی ڕێزلێنانە بە کچو کچەزاکەی!

تا هەموو جیهان بزانن، ئافرەت جێگای سەر سەرە، نەك ژێر پێ!!

ڕاوەستە ئازیزم، چاوەکانت مەکەرەوە، لەو دیمەنە ئەفسووناوییە خۆت مەحرووم مەکە، چیرۆکەکە لێرەدا کۆتایی نایەت!!

لەنێو نوێژدا، سەروەرمان ئومامەی دەکردە باوەشی!

پەیامبەرێك کە شەقی لەهەموو گەنجو گەنجینەیەکی دونیا هەڵداو زێڕوزیوی دەخستە ژێر پێ، بەڵام ئافرەتی دەخستە سەر دڵو نێو دڵ! لەنێو باوەشی دادەنان!

کاتێك دەچوو بۆ ڕکوعو سوجود دای دەنا، دواتر کە هەڵدەستایەوە دووبارە دەیکردەوە باوەشی!

یا «الله» چی دڵێکت هەبوو ئەی «محمد»؟!

چی میهرێك ئەی پەیامبەر!

چی سۆزێك ئەی بابەگیان![1]

چی ڕێزێك، چی شکۆیەك، بۆ ئافرەت ئەی سەرکردە!

نوێژیش ڕێگر نییە، لەوەی چاودێریمان بکەی، لە باوەشمان بگریت، ئاگات لێمان بێت! بمانکەیتە کۆڵ!

بمانبەخشە! تۆ ئێمەت کردە کۆڵ، بەڵام ئێمە لامان دا لە سوننەتی تۆ، کەسانێك هاتن، کردیانین بە کۆیلە، بەڵام ئێمە بووین بە نۆکەریان!!

بەو هەموو شکۆو گەورەییەتەوە، لەگەڵ (زەینەب)ی کچی ئوموسەلەمە، کە بە (زووەینەب) بانگت دەکردو کچی خۆشت نەبوو، چاوشارکێت دەکرد!

سەیرە خۆمان لە تۆ سەندەوەو تەسلیم بە گورگمان کرد!

(٦٣) ساڵ تەمەن، جگە لە گوڵبارانی وشە، پیتێکی کاڵت لە زار نەهاتەدەر!

ڕۆژێك دەنگ لە خێزانێکت بڵند نەکرد! پەنجەیەکت لێ بەرز نەکردەوە! نێو چەوانت لێ گرژ نەکردن!

ژیانی تۆ، هەرگیز بەمەرەکەبی هیچ خامەیەك نانووسرێ، هەرگیز کتێبێك نانوسرێ لە ژیانی تۆدا کە کامڵ بێ، نامەکەی منیش ئەم جارە بێ کۆتاییە؛ چونکە تەنها کەلامی خودا دەتوانێ وەسفت بکات، کەلامی خوداش ( وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِۦ مَدَدًا ﴿١٠٩﴾ )الكهف

[1] ئاماژەیە بە فەرموودەی (إنما أنا لكم مثل الوالد لولده...) أبوداود واتە: من وەکوو باوك وام بۆ ئێوە!

ع.ش.شیرکۆ

# لەگەڵ کتێبدا




## (گەڕان بەشوێن ئافرەتێکی ونبوودا)

ڕۆمانی "البحث عن امرأة مفقودة "نووسینی ڕۆماننووسی سوری عیماد زەکییە، ساڵی ١٩٩٦ کاتێك لە دەرەوەی وڵات بووم خوێندمەوە، نازانم کێ لێی وەرگتبووم‌و نەیگێڕابووەوە بۆم، هەر چەندە بەزەحمەت کتێبم لە دەست دەبێتەوە، دووبارە ساڵی ٢٠١٣ لە پێشانگای نێودەوڵەتیی کتێب لە شاریقە کڕیمەوەو پارساڵیش لە پێشانگای نێودەوڵەتی کتێب لە هەولێر چاوم پێ کەوت، کۆتا ڕۆژەکانی ساڵی ٢٠١٦ دووبارە خوێندمەوە، دوای ٢٠ ساڵ هەستم بە هەمان چێژی ئەو ڕۆمانە کرد.

گەڕان بە شوێن مرۆڤێکدا کە بەتەواوی مانا شەیدای بوویت، ئەگەر بەدرێژایی تەمەن بەردەوام بێت هێشتا کەمە، ئەو کەسەی کە بە یەقینەوە دەزانی کە تاکە هاودەمی ڕۆح‌و ئاشنای دەزوولە خوێنینەکانی لاشەو شادەمارەکانی دڵە!

دۆزینەوەی مرۆڤێکی ڕاستەقینە وەها سانا نییە، تا دوایی بتوانیت دەستی لێ هەڵبگرێت! خۆ مرۆڤ هەموو ڕۆژێ ڕێی لە مرۆڤ ناکەوێت!؟ لەو ڕۆمانەدا (دکتۆر صەلاح) وێڵە بەدوای (دکتۆرە ئەحلام)دا، کە پێشتر لە کۆلێژی پزیشکی‌و دواتریش لە نەخۆشخانە پێکەوە بوون!

ئەو ڕۆمانە ململانێی مرۆڤە پاك‌و بێگەردو فریشتەئاساو خاوەن پەیام‌و بەها بەرزەکانە لەگەڵ مرۆڤە دڕندەو خوێنمژو هەلپەرستو پارەپەرستەکاندا، ئەو کەسانەی کە جگە لە بەرژەوەندیی خۆیان هیچ شتێکی دی نابینن، تەنها ژمارەی باڵانسی حیسابەکانیان زیاد بکات، ئیدی بەهەزاران منداڵ‌و مرۆڤی بێتاوان ببنە قوربانی، هیچ گرنگ نییە.

باوکی ئەحلام بازرگانێکی هەلپەرستو خوێنمژەو دەبینی چۆن بەرواری بەسەرچوونی شیری بەسەرچوو دەستکاری دەکات‌و ئەپارتمانی لاواز درووست دەکات‌و دەیان کەسی لە ژێردا دەبنە قوربانی!

هەر بۆیە دەبێتە بەربەست، لەبەردەم ئەوەی کە کچەکەی ببێتە هاوسەری کوڕێکی هەژار، با خاوەنی ئاکاری بەرزو دڵێکی پاك‌و هەستێکی مرۆڤانە بێت! سەرەتا دەیەوێت ویژدانی دکتۆر سەلاح بکڕێت، بەڵام کە ئەو کارەی بۆ ناکرێت، بەناشرینترین شێوە تۆڵەی لێ دەکاتەوە!

لەو ڕۆمانەدا دەبینی چۆن گەورەکان، بچووکەکان دەخۆن، هێندێك بەناو مرۆڤ، ڕووی هەموو دڕندەکان سپی دەکەن!

دەبینی چۆن بەهۆی ئەوانەوە، ژیانی هەزاران کەس دەبێتە دۆزەخ‌و لە هەموو مافەکانیان بێبەش دەبن!

لەوێدا دەزانیت، کە پارە بەختەوەری درووست ناکات، بەڵکو هەموو ناهەمواری‌و دەردو بەڵاو نادادوەری‌و ستەمێك، بەهۆی باوەشکردن بەدونیاو خۆشەویستیی پارەوسامانەوە درووست دەبێت.

بێکەسی شاعیر لە مێژە گوتویەتی:

ئەوەی لە سامان نزیك بێتەوە
ڕەوشتی بەرزی بیرەچێتەوە

ئەحلام خۆی ون دەکات، بەڵام پەیامەکەی ون نابێت، دکتۆر سەلاح بێهیوا نابێت، لە چاوەڕوانیکردنی ئەحلام بێزار نابێت.

هیوادارم ئەم کتێبە بخوێننەوە، خۆزگە کەسێك هەوڵی وەرگێڕانی دەداو منیش بەهەموو شێوەیەك هاوکاریم دەکرد.

هەرشادبن...